# تَعْظِيمُ الْعِلْمِ

## وَسُلُوكُ الْجَادَّةِ الْمُوصِلَةِ إِلَيْهِ

دانراوی کەناڵی:
الدنیا ظل زائر



الحمد للّه رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف الأنبياء والمرسلين، نبيّنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين.

أمّا بعد:

قال بعض الشعراء:

وما من كاتب إلّا ستبقى
كتابته وإن فنيت يداه
فلا تكتب بكفّك غير شيء
يسرّك في القيامة أن تراه

## العلم ضالة المؤمن

## عيلم و زانست ئەو دەست کەوتە ون بوەیە ئیماندار بە دوای دەگەڕێت.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُبَيْدٍ ( توفيَ ١١٣ هـ) قَالَ: الْعِلْمُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ، كُلَّمَا أَصَابَ مِنْهُ شَيْئًا حَوَاهُ وَابْتَغَى ضَالَّةً أُخْرَى.

عبد الله کوڕی عبید دەیفەرموو: عیلم و زانست ئەو دەست کەوتە ون بوەیە کە ئیماندار بە دوای دەگەڕێت، هەر کاتێک ڕێژەیەک لە زانستی دۆزیەوە وەری دەگرێت و بە دوای عیلم و زانستی کەدا دەگەڕێت[١].

[العلم لزهير بن حرب]

## حاڵ و سەردەمی ئێمە لە طلبي عیلمدا و حاڵی خەڵکی چۆنە

وَقَالَ أَبُو حَازِمٍ: صَارَ النَّاسُ فِي زَمَانِنَا يَعِيبُ الرَّجُلُ مَنْ هُوَ فَوْقَهُ فِي الْعِلْمِ لِيُرِيَ النَّاسَ أَنَّهُ لَيْسَ بِهِ حَاجَةٌ إِلَيْهِ، وَلَا يُذَاكِرُ مَنْ هُوَ مِثْلُهُ وَيُزْهُو عَلَى مَنْ هُوَ دُونَهُ فَذَهَبَ الْعِلْمُ وَهَلَكَ النَّاسُ.

[جامع بيان العلم وفضله]

---

١ - کەواتە عیلم و زانست کۆتایی نییە بزانە ئەی موسڵمان.

أبو حازم دەڵێت: خەڵکی وای لێهاتووە لە زەمەنی ئێمەدا کەسی وا هەیە ئەو کەسانە عەیبدار دەکات و قسەیان پێ دەڵێت کە لە خۆی زانا تر و عالم ترن بۆ ئەوەی وا پیشانی خەڵکی بدات کە بێ پێویستە لێی و هیچ پێویستیەکی بەو کەسە نییە، وە باس و مذاکرەی عیلم یش ناکات لەگەڵ ئەو کەسانەی هاوشانی خۆین لە عیلم و زانستدا، وە فەخریش بەسەر ئەوانەدا دەکات کە لە خواری خۆیەوەن لە زانستدا، عیلم و زانست ڕۆشت و نەما لە نێو خەڵکیدا خەڵکیش بە هەلاکەت چون[1].

## طلبي عیلم بکە پێش ئەوەی بچیتە تەمەنەوە بە جاهیلی و نەزانی کار و کردەوە بکەی

محمدي کوڕی عوف کوڕی سوفیان الطائی دەڵێت: یەکەم حدیث کە معافي کوڕی عمران پێی وتم، حدیثي ام الدرداء رضي الله عنها بوو کە دەفەرموویێت: اطلبوا العلم صغاراً تعملوا به کباراً، فإن لکل حاصدٍ ما زرع، خیراً کان أم شراً.

طلبي عیلم و زانست بکەن بە منداڵی، وە کار و کردەوەی پێبکەن کاتێک کە چوونە تەمەنەوە، هەر کەسێک هەر چی بچێنێت ئەوە دەدورێتەوە لە کۆتایدا، خێر بێت یاخود شەڕ.

[تاریخ دمشق].

١ - لا شـــك حاڵی ئێمە بە چەنـدەها دەرەجە لەو کاتە خراپترە بۆیە زۆر ناڕەحەت ترە طلبي عیلم فێرخواز دەبێ ئاگادار بێت.

## صفة العالم والمتعلم

## دەبێت فێرخواز چۆن بێت

عبد الملك کوڕی قُریب دەڵێت: ئەگەر ئەم چوار خەصلەت و تایبەت مەندیە هەبوو لە کەسی عالم و زانادا، وە لە کەسی طالب العلم یشدا ئەم چوار خەصلەتە هەبوو ئەوا کارەکەیان تەواو و تۆکمەیە، ئەگەر یەک خەصلەت لەو خەصلەتانە کەم بکات ئەوا کارەکەیان تەواو نییە، ئەوەی کە دەبێ لە کەسی عالم دا هەبێت:

دەبێت عاقڵ بێت وە صەبری هەبێت وە بە بەزەی و نەرم و نیان بێت وە بەخشندە بێ لە عیلم ـیدا،

وە کەسی طالب العلم ـیش دەبێ ئەم چوار تایبەت مەندێی تێدا بێت ئەوانیش بریتیین لە: حرصي هەبێت و پێداگر بێت لە وەرگرتنی عیلم وە دڵی خاڵی بێت لە هەر شتێک کە مەژغوڵی بکات وە حفظی عیلم بکات وە خاوەن عەقڵ ـیش بێت،

دواتر دەی فەرموو: ئەگەر عالم و زانا نەزانێت چۆن بە شێوازێکی جوان کار و باری فێرخوازەکان ڕێک بخات بە عەقڵی ئەوا کارەکەی لێ تێک دەچێت و فێرخواز لەلای نامێننەوە، وە ئەگەر هاتوو کەسێکی بە صبر نەبوو نەیتوانی صبر بگرێت لەسەر تەلەبەکانی توشی ملل و بێزاری دەبێت، وە ئەگەر نەرم و نیان نەبێت ئەوا وا دەکات ڕقیان

لێی بێت و عیلم بوغزاو دەکات لایان، وە ئەگەر بەخشندە نەبێت لە عیلم و زانستەکەی و نەیدات بە خەڵکی ئەوا ئیستفادەی لێ ناکەن،.

کەسی طالبي عیلم ئەگەر عەقڵی نەبوو تێناگات وە ئەگەر حرص و پێداگری نەبوو لەسەر عیلم ئەوا فێر نابێت و تێناگات، وە ئەگەر دڵی فەراغ و خاڵی نەبوو لە هەموو شتێک ئەوا لە مامۆستاکەی تێناگات وە ئەگەر حیفظی خراپ بێت ئەوەی کە وەری دەگرێ لای مامۆستاکەی وەک ئەوەیە شت بنوسی لەسەر ئاو.

[جامع لأخلاق الراوي]

# پێرست

# پێشەکی

سەرەتا موسڵمان دەبێت بزانێت بەشی هەر کەسێک لە عیلم و زانست بە ئەندازەی گەورەی و هەیبەتی عیلم و زانستە لە دڵی ئەو کەسەدا هەر چەند زیاتر گەورە بێت لە دڵتدا ئەوەندە ڕێژەی زیاترت بۆ هەیە لە عیلمدا.

وبقدر نقصان هيبة العلم في القلب ينقص حظ العبد منه، حتى يكون من القلوب قلب ليس فيه شيء من العلم.

وە بە ئەندازەی کەمی هەیبەتی عیلم و زانست لە دڵدا، ئەوەندە کەم دەکات بەشت لە عیلمدا، هەتا دڵی وا هەیە هیچ بەشێکی تێدا نییە لە عیلم و زانست

هەر کەسێک عیلم بە گەورە تەماشا بکات نور و ڕوناکی زانستی لەسەر دەر دەکەوێت
هەر کەسێک ڕێزی عیلم و زانست نەگرێت عیلم و زانست یش ڕێزی ناگرێت و دوا جار بێ ڕێز دەبێت

## فضل و پێگەی علم و زانست و زانیاری شەرعی لە ئیسلامدا

ئاماژە بۆ هەندێک لەو فضائلانە بکەین ئەوا دەڵێین لە فەزڵ و گەورەی و شەرەفی زانست و عیلمە کە یەکێک لە ناوەکانی اللّە جل جلالە (العلم)

وە اللّە وەصفی ذات موبارەکی کردووە بەوەی کە علیمە لە چەندین ئایەت،

اللّە تعالی دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾ [الملك ١٣]، وە لە جێگای کەدا دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيم﴾ [الأنعام ٨٣].

لە فەزڵ و گەورەی زانستی شەرعیە اللّە جل جلالە وەصفی هەڵگرانی زانست و زانیاری شەرعی کردووە و مەدحی کردوون اللّە جل جلالە دەفەرموویێت: ﴿وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَاۗ﴾ [آل عمران ٧].

اللّە دەفەرموویێت: ﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُو الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ [آل عمران ١٨] اللّە تعالی لەسەر توحید و وەحدانیەتی خۆی نەفسی موبارەکی بە شاهید داناوە وە ملائکەکان وە ئەهلی عیلم وە لە گەورەی و شەرەفی ئەهلی عیلمە ناویان لەگەل پێغەمبەران علیە الصلاة والسلام هێنراوە

جیانەکراونەتەوە لێیان ﴿وَأُوْلُو الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ﴾ أولو العلم پێغەمبەران و زانایانن.

لە فەزڵ و گەورەی و شەرەفی عیلمە کە اللّه جل جلاله پێشی خستووە بەسەر کار و کردەوەدا اللّه دەفەرموویێت: ﴿فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلَهَ إِلا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ﴾ [محمد ١٩] یەکەم ئەمرێک بە ئیمانداران بریتییە لە علم و زانست دواتر کار و کردەوە بکەن لەسەر ئەم ئایەتە ترجمە کراوە (بَابٌ الْعِلْمُ قَبْلَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ) زانست و زانیاری لە پێشی گوفتار و کردارە.

لە فضل و گەورەی و شەرەفی عیلمە کە رسول اللّه ﷺ ئەمری پێنەکراوە بە زیادە لە هیچ شتێک لە دونیادا جگە لە عیلم و زانست ﴿وَقُلْ رَبِّ زِدْنِي عِلْمًا﴾ [طه ١١٤].

قال ابن عيينة: ولمْ يَزلْ رسول اللّه ﷺ فِي زِيَادَة مِنَ الْعِلْمِ حتى تَوَفاهُ اللّهُ عَز وَجَل. [تفسير ابن كثير]

امام سوفیان بن عیینة دەیفەرموو: رسول اللّه ﷺ بەردەوام هەوڵی بۆ بەدەست هێنانی زیادەی عیلم و زانست بوو هەتا ئەو کاتەی اللّه جل جلاله ئەمری کرد بە گێڕانەوەی بۆ لای خۆی و ژیانی دونیای جێهێشت ﷺ.

لە فضل و گەورەی عیلمە کە دەستپێکی رسالەی اللّە جل جلالە بۆ لای ئەهلی ئیسلام ئەمر کردنە بە خوێندنەوە ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ﴾ [العلق ١] خوێندنەوە مەسلەک و ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە زانست و عیلم.

علم و زانست بریتییە لە پێشترین و باشترین وەصف بۆ کەسێک لە ناو مرۆڤایەتیدا تۆ ئەگەر بتەوێ وەصفی کەسێک بکەیت بە شتێکی زۆر جوان و گەورە ناتوانی بە باشتر و چاکتر لە عیلم و زانست وەصفی بکەیت هەر بۆیە کاتێک اللّە جل جلالە آدم علیه السلام دروست دەکات بە جوانترین شێواز و تۆکمەترین شێواز دروستی دەکات، چەندەها صفەتی بەرز و چاکی پێدەبەخشێت کە بە شێوازێک بێت فەزڵی هەبێ بەسەر زۆرێک لە مەخلوقاتدا، بەڵام لەگەڵ ئەم هەمووە لە صفەتی کمال لە ئادەم اللّە عز وجل کاتێک ویستی فضل و پێگەی ئادەم دەربخات بۆ ملائکەتەکان لەو کاتەدا باشترین شتێک لە لای ئادەم علیه السلام کە اللّە بۆ ملائکەتەکانی باس بکات تا لە ڕێگەیەوە فەزڵ و گەورەی ئادەم یان بۆ دەربکەوێ بریتییە لە علم و زانست وەک، اللّە جل جلالە دەفەرموویێت ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الْأَسْمَاءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلَائِكَةِ فَقَالَ أَنْبِئُونِي بِأَسْمَاءِ هَؤُلَاءِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ [البقرة٣١] لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەقوالی مفسرین زۆرە،

وتراوە ناوی هەموو شتێکی دەزانی، وتراوە ناوی هەموو نەوەکانی خۆی دەزانی، وتراوە ناوی هەموو ملائکەتەکانی دەزانی.

[تفسير الطبري]

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زانست و علم أفضل ترین و باشترین شتێکە لە مرۆڤدا هەر بەمەش الله تعالى کاتێک ویستی فەزڵ و گەورەی ئادەم پیشان ملائکەتەکان بدات عیلم و زانستەکەی دەر خست بۆیان.

مەعلومە کاتێک الله جل جلاله ویستی فەزڵ و پێگەی پێغەمبەر یوسف عليه السلام دەربخات بۆ عەزیزی مصر بە لێکدانەوەی خەوەکەی عەزیزی مصر الله پێگە و مەکانەتی یوسفي دەرخست بۆیان دوای ئەوەی کە تەفسیری خەوەکەی بۆ دەکات عەزیزی مصر لە خۆی نزيك دەکاتەوە و دەیکات بە سەرپەرشتیاری خزائنەکەی، لە کاتێکدا لە پێشتردا عەزیزی مصر بو حوکمی کرد بە سجن کردنی یوسف لەو کاتەی حوکمی کرد بە سجن کردنی دەیبینی پێغەمبەر یوسف عليه السلام چەند جوان و هەڵکەوتەیە بەڵام جوانی و هەڵکەوتەی یوسف وا ناکات لە عەزیزی مصر حوکم نەکات بە سجن کردنی دواتر کە یوسف باشترین شتێک کە عیلم و زانستەکەی بوو بە تەفسیری خەو دەری خست بۆ عەزیزی مصر نەك هەر دەری کرد لە سجن بەڵکو لەخۆی نزیک کردەوە و کردی بە سەرپەرشتیاری مصر

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بە بەهای و فەزڵ و پێگەی مرۆڤ لە جسم لاریو ماڵ و سامانیدا نییە بەڵکو قەدر پێگەی مرۆڤ لە عیلم و زانست دایە بەوە بە بەهایە مرۆڤ.

## لە فەزڵ و گەورەی عیلم و زانستە کە خاوەنەکەی پێگەی بەرزە لە دونیا و دوارۆژدا پێگەی جیاوازە لە باقی خەڵکی

**ابن عباس** رضي اللّه عنهما لە تەفسیری قەولی اللّه دا ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ والَّذِينَ أُوتُوا العِلْمَ دَرَجاتٍ﴾ [المجادلة ١١] دەیفەرموو: اللّه جل جلالە لە ڕۆژی قیامەتدا فەزڵی پلەی ئەو ئیمانداراانەی زانان و خاوەن عیلمن دەدات بەسەر ئەوانەی کە ئیماندارن بە چەندەها دەرەجە.

[سنن الدارمي]

**عبد اللّه بن مسعود** دەیفەرموو: اللّه تعالی زانایانی جیانەکردووەتەوە و باسیان بکات بە تایبەت لە هیچ جێگایەک لە قورئان ـدا وەک ئەم ئایەتە ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ والَّذِينَ أُوتُوا العِلْمَ دَرَجاتٍ﴾ [المجادلة ١١] دواتر دەیفەرموو: اللّه جل جلالە فەزڵی ئەو ئیمانداراانەی کە خاوەن عیلم و زانستن دەدات بە سەر ئەوانەی کە ئیماندارن و خاوەن عیلم نین بە چەندەها دەرەجە.

[تفسیر البغوي]

له فەزڵ و گەورەی زانستی شەرعیە طالب العلم ـیش بێبەش نییە لەم شەرەف و فەزڵە کە ئەوەی لە ئەرز و ئاسمانەکانە دوعا بۆ طالب العلم دەکەن.

عبد اللّه بن عباس رضي اللّه عنهما دەیفەرموو: ئەو کەسەی کە خەڵکی فێری زانست دەکات هەموو دروست کراوەکان دوعای بۆ دەکەن و داوای لێخۆشبونی بۆ دەکەن هەتا ماسی لە ناو دەریادا دوعای بۆ دەکەن. [تفسير ابن القيم]

له شەرەف و گەورەی عیلمە هەر کەسێک هەڵگری بێت لە ناو خەڵکیدا پلەی بەرز دەبێت

قال سفيان الثوري لرجل من العرب: ويحكم اطلبوا العلم، فإني أخاف أن يخرج العلم من عندكم فيصير إلى غيركم فتذلون، اطلبوا العلم فإنه شرف في الدنيا وشرف في الآخرة. [جامع بيان العلم وفضله]

سوفیان الثوري دەیوت بە پیاوێک لە عەرەب: هاوار بۆ ئێوە طلبي عیلم بکەن من ئەترسم ئەو علمە لە ئێوە دەربچێت و کەسانێکی دیکە لە غەیری عەرەب بەدەستی بهێنن ئەو کات ئێوەی عەرەب زەلیل ببن، دەی طلبي عیلم بکەن شەرەفە بۆ خاوەنەکەی لە دونیادا و شەرەفە بۆی لە ئاخیرەتدا.

## گەورەترین نیعمەتێک درابێ بە بەندە لە دونیادا بریتییە لە نیعمەتی تەوحید و عیلم و زانستی شەرعی

قال سفيان بن عيينة: لم يعط أحد في الدنيا أفضل من النبوة، وما بعد النبوة شيء أفضل من العلم والفقه. فقيل عمن هذا فقال: عن الفقهاء كلهم. [الفقيه والمتفقه]

سوفیانی کوڕی عیینە دەیفەرموو: لە دونیادا هیچ کەسێک أفضل ترو باشتری پێنەبەخشراوە لە النبوة پێغەمبەرایەتی، لە دوای مەرتەبەی پێغەمبەرایەتی لە دونیادا هیچ کەسێک باشتر و أفضل تری پێنەدراوە لە عیلم و فقهـ لە دیندا، پێیان وت ئەمە لە کێوە، فەرمووی: لە هەموو فوقەهایان تێکرا.

## لە سعادە و خۆشگوزەرانی مرۆڤە لە دونیادا عیلم و زانستی پێببەخشرێت

عن ابن وهب، قال: سمعت مالكاً، يقول: أن حقاً على من طلب العلم أن يكون له وقار وسكينة وخشية، والعلم حسن لمن رزق خيره، فإن من سعادة المرء أن يوفق للخير. [حلية الأولياء]

ابن وهب دەڵێت گوێم لە مالك بوو دەیفەرموو: ئەوەی حەقە لەسەر طالب العلم کە لەسەر خۆ و نەرم و نیان و ئارام بێت و لەخوا ترسان لە دڵیدا بێت، وە عیلم و زانست چاک و جوانە بۆ ئەو کەسانەی خێریان پێبەخشراوە لە عیلمدا[١]، لە سعادە و خۆشگوزەرانی مرۆڤەکانە کە اللە تەوفیقیان بدات بۆ خەیر.

## هۆکارێک بۆ نەجاتی مرۆڤ لە قیامەت نشر کردنی عیلمە

قال إبراهيم النخعي: توزن حسنات العبد وسيئاته يوم القيامة، فتخف حسناته فيجاء بشيء أبيض مثل الغيم أو الغمام، فيوضع في ميزانه، فيثقل ميزانه، فيقال له هل تدري ماذا؟ فيقول: لا، فيقال: هذا الخير الذي علمته النَّاس، فعملوا به بعدك.

الجامع لابن وهب

إبراهيمي النخعي دەفەرموویت: لە ڕۆژی قیامەتدا چاکە و خراپەی عەبد دەکێشرێت، چاکەکانی کەم و سوکن لە بەرامبەر خراپەکانیدا لەو کاتەدا شتێکی سپی دێنن هاو شێوەی هەورە، دەیخەنە سەر

---

١ - لە سیاقی قسەکەی ڕونی کردەوە کە عیلم جوانیە بۆ مرۆڤ کە خەیرەکەی پێبدرێ دواتر دەڵێت هەر کەس تەوفیق بدرێ بۆ ئەو خەیرە بەڕاستی خۆشگوزەرانە واتە عیلم

میزان و کردەوە چاکەکانی قورس دەکات پێی دەڵێن دەزانیت ئەوە چیە؟ ئەویش دەڵێت نەخێر نازانم، پێی دەوترێت: ئەوە ئەو خەیر و چاکەیە کە فێری خەڵکیت کرد، خەڵک ـیش لە دوای تۆ کاریان پێی کرد.

## سلوك الجادة الموصلة إليه

## بۆ هەر شتێک کە مرۆڤ هەوڵی بۆ بدات ڕێگایەک هەیە بۆ گەیشتن پێی

وە هەروەها بۆ عیلم و زانست ـیش ڕێگایەک هەیە هەر کەس لێی لابدات ونی بکات ناگات بە مەبەست، هەرچەن هەوڵ بدات و خۆی ماندو بکات مادام لە ڕێگا لای داوە ناگات بە مەبەست لەگەڵ زۆرێک لە ماند و بون جوزئێکی کەمی دەست دەکەوێ لە زانست[١].

## گرتنە بەری ڕێگەی طلبي عیلم و زانست

بە دەست هێنانی زانست و زانیاری شەرعی ڕێگا و مەسلەکێکە کۆتاییەکەی دەت گەیەنێت بە بەهەشت رسول اللّه ﷺ دەفەرمووێت: (مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا ؛ سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ) [صحيح مسلم]

---

١ - نابینن رحمکم اللّه کەسی وا هەیە بە مەداری ساڵێک بە قەدەر چەندەها ساڵی کەسێکی کە بە دەست دێنێت لە زانست سەبەب گرتنە بەری ڕێگای ڕاست و هەڵەیە ڕاست ترین ڕێگاش بۆ طلبي زانست لای ئەو کەسانەیە کە سەرچاوەی ئەم زانستەن کە سەلەفي ئومەتن رحمهم اللّه.

هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتە بەر بۆ بە دەست هێنانی زانست و علم، ئەوا اللّە ڕێگای گەیشتنی بە بەهەشت بۆ ئاسان دەکات

مکحول دەیوت: هەر کەسێک دەربچێت بۆ فێربوونی عیلم و زانستێک ئەوا لەسەر ڕێگەی بەهەشتە هەتاوەکو دەگەڕێتەوە.

[حلية الأولياء]

ئایا دەبێت هەر ڕێگا بگریتە بەر بۆ مجالسی ئەهلی عیلم و چوون بۆ لای زانایان ئینجا ئەم حدیثە دەت گرێتەوە؟

ابن رجب دەڵێت: ڕێگای بە دەست هێنانی زانست دەکرێت مەبەست پێی ڕێگای حەقیقی بێ بە پێ ڕۆشتن بۆ مجالسی ئەهلی عیلم و زانست، نموونە بۆ ئەمە رحلەت کردنی هاوەڵان و سەلەفە بۆ بەدەست هێنانی حدیث، ئەوەی بەسمانە لەمەدا چیرۆکی پێغەمبەر موسایە علیه السلام کاتێک کە چوو بۆ لای الخضر، ئەگەر کەسێک بێ پێویست بوا لە رحلەت کردن بۆ بە دەست هێنانی عیلم و زانست ئەوا پێغەمبەر موسا دەبوو علیه الصلاة والسلام، هەر وەک چۆن اللّە قسەی لەگەڵ کرد و تەوراتی پێدا کە لە هەموو شتێکی بۆ نوسرابوو تێیدا، لەگەڵ ئەمەشدا کاتێک اللّە جل جلالە هەواڵی پێدا دەربارەی الخضر کە زانستێکی لەلایە تایبەت بەو دراوە، پێغەمبەر موسا داوای ڕێگای گەیشتنی کرد بە الخضر و چوو بۆ لای،

وە دەکرێت مەبەست پێی ڕێگایەکی مەعنەوی بێت بۆ گەشتن بە عیلم و زانست نمونە: حفظ کردنی زانست و دراسە کردنی و مطالعە کردنی و مذاکرە و تێگەشتن لێی و تفکر کردن تێیدا و نمونەی ئەمانە لەو ڕێگایانەی دەت گەیەنێت بە عیلم و زانست[1].

(سَهَّلَ اللّٰہُ لَهُ بِهِ طَرِيقًا إِلَى الْجَنَّةِ) لەسەر ئەم بەشەی فەرمووودەکە ابن رجب دەڵێت: حمل دەکرێتە سەر چەند شتێک:

دەکرێت: اللّه جل جلالە ئاسانی بکات بۆ طالب العلم ئەو زانست و عیلمەی کە هەوڵی بۆ دەدات و ڕێگای گرتووەتە بەر بۆی ئاسانی بکات بۆی، بەڕاستی زانست ڕێگایەکە خاوەنەکەی دەگەیەنێت بە بەهەشت، وەک قەولی اللّه تعالی کە دەفەرمەیێت: ﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ﴾ طائفەیەک لە سەلەف دەڵێن لە تەفسیری ئەم ئایەتە (هل من طالب علم فيعان عليه) ئایا کەسێك هەیە داوای عیلم و زانست بکات یارمەتی بدرێت لەسەر طلب کردنەکەی.

ابن رجب دەڵێت: دەکرێت اللّه جل جلالە ئاسانی بکات بۆ طالب العلم کاردکردن بە عیلمەکەی، ئەگەر ئەم کەسە قصدی بۆ اللّه بوو لە عیلمەکەی اللّه دەیکات بە سەبەبی هیدایەت دانی و سود لێوەرگرتنی و کارپێکردنی وە ئەمەش ڕێگایەکە بۆ گەیشتن بە بەهەشت.

---

١ - شەرەفە بۆ فێرخواز کە لەماڵەکەی خۆیدا ئەم حدیثە دەیگرێتەوە.

وە دەکرێت: اللّه تعالی ئاسانی بکات بۆ طالب العلم زانست و زانیاری دیکە ئەم زانستەی دیکەش کە بەدەستی دێنێت ببێت بە ڕێگایەک بۆ بەهەشت بۆی هەر وەک چۆن وتراوە (من عمل بما علم أورثه اللّه علم ما لم يعلم)، یان چۆن وتراوە (ثواب الحسنة الحسنة بعدها)، وە ئەمەش قەولی اللّه جل جلاله دەفەرمووێت ﴿وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ هُدًىۗ﴾ [مريم ٧٦] وقوله ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْاْ زَادَهُمْ هُدى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ﴾ [محمد ١٧] دەڵێت: هەر کەسێک زانستێک بە دەست بێنێت بۆ ئەوەی بەرچاو ڕوون بێت اللّه زیاتر هیدایەتی دەدات و عیلمی بە سودی پێدەدات، وە کردەوەی چاکیشی پێدەدرێت، هەموو ئەم ڕێگایانەش بەرەو بەهەشتت دەبەن.

پاشان ابن رجب دەڵێت: هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتە بەر وا گومان ببات کە ڕێگای گەیشتن بە بەهەشتە بە بێ عیلم و زانست، بەڕاستی نارەحەتترین و قورسترین ڕێگای گرتووەتە بەر، وە هەروەها نایشی گەیەنێت بە مەبەست لەگەڵ ئەو هەمووە لە ماندوو بوون[١].

---

١ - بۆیە دەبێت فێرخوازی زانست بزانێت ئەو ڕێگای دەیگرێتە بەر ئەو دارِشتەیە کە سەلەف کردوویانە بۆ ڕێگای گەیشتن بە عیلم لە هەردوو لایەنەوە سەلەف دیاریان کردووە دەبێ چۆن پێبگەیت و تێبگەیت هەم ڕێگای مەعنەوی هەم ڕێگای حقیقی ئەگەر بەو شێوازە نەکەیت ئاوا بەس ماندوو بوون و هیلاکیت بۆ دەمێنێتەوە.

هیچ ڕێگایەک نییە بۆ گەیشتن بە ناسینی اللّە جل جلالە وە گەیشتن بە ڕازیبوون و بە دەست هێنانی دواڕۆژ ئیللا بە عیلمی نافع نەبێت دواتر دەڵێت: عیلم و زانستی بە سود ئەوەیە کە اللّە رسول اللّە ﷺ ي ناردووە پێی و کتابی بۆ دابەزاندووە، هەر بەو کتابەیە ڕێنمونی دەکرێن لە ظلمات و نەزانی و شک و گومان، اللّە کتابەکەی ناو ناوە نوور خەڵکی ڕێنمونی دەکات لە تاریکای جەهل بۆ نوور

﴿قَدْ جَاءَكُم مِّنَ اللَّهِ نُورٌ وَكِتَابٌ مُّبِينٌ ١٥ يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِهِ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَاطٍ مُّسْتَقِيمٍ ١٦﴾

[المائدة]

[جامع العلم والحكم]

کەواتە بۆمان دەرکەوت دوو ڕێگا هەیە بۆ گەیشتن بە عیلم و زانست هەردوو ڕێگاکەش دەچنە ژێر حدیثي (من سلك طريقا يلتمس فيه علما).

ڕێگای یەکەم: بریتییە لە گرتنە بەری ڕێگەی گەیشتن بە ئەهلی عیلم و چون بۆ مجالسی ئەهلی عیلم.

ڕێگای دووەم: ڕێگەی مەعنەوی بوو بریتییە لە حفظ کردن و مطالعە کردن و مذاکرە کردن ئەم ڕێگایان لە ئاخر زەماندا زیاتر دەگیرێتە لەبەر ئەو فتنە و شبهاتەی باڵ دەکێشێ بە سەر ئومەتی ئیسلامدا

وەک ئەم کاتەی خۆمانی تێداین وەک رسول اللّه ﷺ دەفەرمووێ: دەربارەی بانگ کەرانێک بانگتان دەکەن بۆ جهنم (دُعَاةٌ علَى أَبْوَابِ جَهَنَّمَ مَن أَجَابَهُمْ إلَيْهَا قَذَفُوهُ فِيهَا) بۆیە دەبێ موسڵمان ئاگادار بێت و سەیر بکات عیلم و دین لە کێ وەردەگرێت.

طریقا: دیاری نەکراوە حتما هەر کەسێک کتێب ـێکیش بخوێنێتەوە دەگات بە جوزئێک لە عیلم بەڵام ئەو عیلمەی کە لای سەلەف بووە هەر بەو ڕێگا پێی دەگەیت کە خۆیان دیاریان کردووە ڕێگای ئەوانیش لە مەعنەوی و حەقیقی دیارە بۆ هەر کەسێک سیەر و ژیان نامەیان بخوێنێتەوە[1] نموونەیەک بۆ ئەمە کە تۆ لەگەڵ هەر خاڵێک لە شێوازی طلبي عیلمی سەلەف لە دەست بدەی ئەوا عیلمێکی زۆر لە دەست دەدەی:

---

١ - لە إخلاص و نیەتیان لە حرص و پێداگریان لە مەشەقەت و ماندوو بونیان لە ڕێز گرتنیان لە ئەهلی عیلم و خۆش ویستنیان بۆ حدیث و مذاکرە کردن و مطالعە کردن و خوێندنەوەی جار لە دوای جار و حفظ کردن و دانانی هەیبەتیان بۆ عیلم لە هەموو جانبێک بۆیە هەر کات فێرخواز هەر یەکێک لەمانە لە دەست بدات عیلمێکی زۆر لە دەست دەدات ئەمەش لە گەورەی و فەزڵی ئەو پیاوانەیە اللّە کردنی بە هۆی بە پاک ڕاگرتنی ئەم دینە.

الزهري و الشعبي دەڵێن: أبو سەلەمە جدالی دەکرد لەگەڵ ابن عباس رضي اللّه عنهما ئەم جیدال کردنەی بوو بەهۆی ئەوەی بێبەش ببێت لە عیلمێکی زۆر.

[جامع بيان العلم وفضله]

بۆیە طاوس دەی وت: لە سوننەتە ڕێزی عالم و زانا بگیرێت.

بۆ هەر خاڵێک کە سەلەف دایان نابێت لەگەڵ لە دەست دانی عیلمێکی زۆر لە دەست دەدەی بۆیە ئاگاداربە، إن شاء اللّه گرنگی ئەم خاڵانە لە خوارەوە بە بەڵگە ڕون دەکەینەوە.

## تطهير وعاء العلم وهو القلب

یەکەم خاڵێک طالب العلم ئەنجامی بدات پاک کردنەوەی دڵێتی لە هەر کیبر و پیسیەک کە تێیدا بێت لە شبهات و شەهەوات وە بشزانە بە ئەندازەی پاکی دڵت عیلم و زانستی تێدەچێت تا زیاتر پاک بێت زیاتر وەردەگرێت وە دڵنیابە بەروبوومی پاک کردنەوەی دڵ جێگیر بوونی زانستە لەو دڵە پاکو بێگەردە دا.

قال الإمام مالك رحمه اللّه: العلمُ نَفُورٌ لا يأنسُ إلا بقلب تقي خاشع.

[ترتيب المدارك]

امام مالك دەیفەرموو: صفەتی عیلم و زانست وایە کە ڕادەکات لە خەڵکی و لایان نامێنێتەوە، جێگیر نابێ ئیللا لە دڵێکدا نەبێ کە تەقوا و ترس و خشوعی تێدا بێ بەرامبەر بە اللّه جل جلاله.

قال سهل بن عبد اللّه: وحرام على قلب أن يدخله النور وفيه شيء مما يكرهه اللّه.

[الزهد والرقائق للخطيب]

سهلي کوڕی عبد اللّه دەیفەرموو: حەرامە لەسەر دڵێک کە نوور و ڕووناکی تێبچێت[1]، لە کاتێکدا شتێک لەو دڵەدا بێ اللّه پێی ناخۆش بێ.

---

١ - واتا عیلم و زانست.

بۆیە وتراوە:

فالعلم جوهر لطيف.. لا يصلح إلا للقلب النظيف

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: (إِنَّ اللّهَّ لَا يَنْظُرُ إِلَى صُوَرِكُمْ وَأَمْوَالِكُمْ، وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَعْمَالِكُمْ) [صحيح مسلم]

واتا: اللّه جل جلاله سەیری شێوە و شکڵتان و ماڵ و سامانتان ناکات، بەڵکو سەیری دڵەکانتان و کارو کردەوە کانتان دەکات.

## إخلاص النية فيه

دووەم خاڵ بۆ طالبي عيلم بريتييە لە إخلاص، بۆيە ئاگاداربە بە ئەندازەی إخلاص ـت عيلم و زانستت بۆ هەيە، ڕاستگۆی لە نيەتدا بۆچی طلبي زانست دەكەيت؟ بۆ وەظيفەيەک؟ بۆ مينبەر؟ ياخود بۆ ئەوەی ببيت بە مامۆستا و ئيشارەتت بۆ بكرێت؟ خەڵكانێک هەن بۆ ئەمە طلبي زانست دەكەن ئاماژەی پێ دەدەين بە قسەی سەلەف.

اللّه جل جلاله دەفەرموويێت ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ﴾ [البنية ٥].

قال سفيان الثوري: ما عالجت شيئاً أشد علي من نيتي، لأنها تتقلب علي. [الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

سوفياني الثوري دەيفەرموو: چارەسەری هيچ شتێكم نەكردووە قورستر بێت لەسەرم لە چاک كردنی نيەتم بۆ اللّه، لەبەر ئەوەی دەگۆڕا لەسەرم[١].

---

١ - واتا نيەت جێگير نييە لەسەر يەک شت ئەملاو لا دەكات و دەگۆڕێت، سوفيان ئاوا دەفەرمووێ ئومەتێک وەصفی دەكەن با زوهد و تەقوا فكيف بنا بەم لاوازیێ.

قال يوسف بن أسباط: أعز شيءٍ في الدنيا الإخلاص، وكم أجتهد في إسقاط الرياء عن قلبي، وكأنه ينبتُ فيه على لون آخر.

[جامع العلوم والحكم]

يوسفي كوڕى أسباط دەيفەرموو: گەورەترين شتێک لە دونيادا بريتييە لە إخلاص، چەندەها کەس خۆى ماندوو دەکات بۆ لابردنى ڕيا لە دڵيدا، وەک بڵێى سەوز دەبێتەوە لەسەر ڕەنگ و جۆرێکى تر[١].

عن الخنيسي، قال: سمعت رجلا قال لسفيان الثوري: لو أنك نشرت ما عندك من العلم رجوت أن ينفع اللّه به بعض عباده، وتؤجر على ذلك، فقال سفيان: واللّه لو أعلم بالذي يطلب هذا العلم لا يريد به إلا ما عند اللّه لكنت أنا الذي آتيه في منزله، فأحدثه بما عندي مما أرجو أن ينفعه اللّه به. [حلية الأولياء]

الخنيسي دەڵێت گوێم لە پياوێک بوو بە سوفيانى دەوت: ئەگەر ئەو عيلمەى لە لاتە بڵاوى بکەيتەوە و خەڵکى فێر بکەيت، ڕەجام وايە اللّه جل جلالە ئيستيفادە بە هەندێک لە خەڵکى بگەيەنێ لەو زانستەى بە تۆيە، وە تۆش ئەجر و پاداشتت بۆ هەيە لاى اللّه،

---

١ - دڵ دايم پێويستى بە پاک کردنەوەيە لەگەڵ غافڵ بوون لێى ماڵت وێران دەکات.

سوفیانی الثوري فەرمووی: سوێند بە اللە ئەگەر بزانم کەسێک هەیە طلبي عیلم دەکات تەنها مەبەستی پێی الله ـیە ئەوا من دەچووم بۆ ماڵ ئەو کەسە و لە ماڵەکەی خۆیدا ئەو عیلم زانستەی بە منە پێم دەدا لەوەی کە رەجام وایە اللە بیکات بە مایەی سود بۆی[١].

عن سليمان الهاشمي قال: ربما أحدث بحديث واحد، ولي نية، فإذا أتيت على بعضه، تغيرت نيتي، فإذا الحديث الواحد يحتاج إلى نيات.

[سير أعلام النبلاء]

سلیمان الهاشمي دەڵێت: زۆر کات کە حدیثێکم دەگێڕایەوە نیەتم هەبوو بۆ اللە، کاتێ هەندێ لە حدیثەکە دەڕۆشتم نیەتم دەگۆڕا، بۆ یەک حدیث پێویستت بە چەند نیەتێکە[٢].

---

١ - سبحان اللە سوفیان لە ساڵی ١٦١ هیجری وەفاتی کردووە ئاوا دەفەرموویێت دەبێ حاڵ و سەردەمی خۆمان چۆن بێت کە خەڵکی وای لێ هاتووە خۆی خۆی فضح دەکات و باسی ماندوو بوونی ڕێگای طلبي عیلم دەکات و دەڵێت ئاوام کرد و ئاوام کرد!؟ یان دەڵێن فلان هیچی نەدەزانی ئێمە فێرمان کرد تۆ لە کوێی سەلەفدای ئەخلاقی سەلەف لە کوێی تۆدایە سبحان اللە وات لێبێت بڵێی فلان کەس پێی دەوتم مامۆستا!؟ أين نحن من أخلاق هؤلاء الذين ذب عن الحق؟

٢ - واتا بۆ یەک حدیث بیگێڕیتەوە یان قسەیە دەیکەی نیەت دەگۆڕێ دەبێت دووبارە نیەتت بهێنیتەوە سەر ڕێگاکە کە إخلاصە.

عن سهل بن عبد اللّه قال رحمه اللّه: الدنيا جهل وموت إلا العلم، والعلم كله حجة إلا العمل به، والعمل كله هباء إلا الإخلاص، والإخلاص على خطر عظيم حتى يختم به.

سهل كوڕی عبد اللّه دەیفەرموو: دونیا جاهیلیەت و مردنە بە بێ عیلم، عیلمیش هەمووی حوجەیە لەسەر خاوەنەکەی لە قیامەتدا ئیللا ئەو ڕێژەی نەبێ کار و کردەوەی پێکراوە، وە کار و کردەوەش لە قیامەتدا بە فیڕۆ دەڕوات ئیللا ئەو ڕێژەی نەبێ ئیخلاصی تێدا بووە، ئیخلاص ـیش لەسەر خەتەریەتێکی گەورەدایە هەتا ئەو کاتەی دەگەڕێنەوە بۆ لای اللّه.

عن عبد العزيز بن أبي رزمة قال: أتينا إسرائيل مع نفر من أهل خراسان فسألَنا؛ قلنا: نحن من أهل مرو؛ فقال: مرو أم خراسان، فإن استطعتم أن لا يكون أحد أسعد بما سمعتم منكم، فافعلوا؛ من طلب هذا العلم للّه تعالى شرف وسعد في الدنيا والآخرة؛ ومن لم يطلبه للّه خسر الدنيا والاخرة. [الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

عبد العزيزي كوڕی أبي رزمة دەڵێت: چوین بۆ لای إسرائيل لەگەڵ چەند کەسێکدا لە خەڵکی خوراسان پرسیارمان لێکرد و وتمان ئێمە خەڵکی مروین، وتی: مرو بێ یان خوراسان، ئەگەر توانیتان هیچ یەکێک لە ئێوە دڵخۆشتر نەبێ بەوەی بیستوتانە ئەوا وابکەن دواتر

قسەکەی بۆ کردن و فەرمووی: هەر کەسێک طلبي ئەم زانستە بکات تەنها بۆ اللّە ئەوا گەورە دەبێت و خۆشکوزەران دەبێت لە دونیا و لە ئاخیرەتدا، وە هەر کەسێکیش لەبەر ڕەزامەنی اللّە طلبي نەکات ئەوا ماڵ وێران و خەسارەت مەندە لە دونیا و ئاخیرەتیشدا.

قال سفيان الثوري رحمه اللّه: ما شيء أخوف عندي منه يعني الحديث وما من شيء يعدله لمن أراد اللّه به.

[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

سوفياني الثوري دەیفەرموو: هیچ شتێک لەلام ترسناک تر نییە لە طلب کردنی حدیث، وە هیچ شتێک ناگاتە گەورەی طلب کردنی حدیث بۆ ئەو کەسانەی تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی اللّە ـیە.

ذُكِر للإمام أحمد رحمه اللّه الصدق والإخلاص

قال: بهذا ارتفع القوم.

[طبقات الحنابلة لابن أبي يعلى]

باسی ڕاستگۆی و إخلاص کرا لە لای امام أحمد فەرمووی: بەمە بوو خەڵکی پلەو پێگەیان بەرز بوو[١].

---

١ - واتا بە إخلاص و ڕاستگۆی لەگەڵ اللّە دا خەڵکی گەیشتن بەوەی کە پێی گەیشتن لە هاوەڵان و تابعین.

## فساد النية في طلب العلم

## خراپی نیەت لە طلب کردنی عیلم و زانستدا

قال أبو قلابة وهو من أعلام التابعين: إذا أحْدَثَ اللَّهُ لك علمًا فأحْدِثْ له عبادةً، ولا يَكُنْ إنَّما همُّكَ أنْ تُحَدِّثَ به النّاسَ.

[اقتضاء العلم العمل للخطيب]

أبو قلابة دەیفەرموو: هەر کاتێک اللّه تعالى زانست و عیلمێکی تازەی پێبەخشیت ئەوا تۆ عیبادەتێکی تازە ئەنجام بدە بەو عیلمەی پێت دراوە، با هەم و هەوڵت ئەوە نەبێ بیگەیەنی بە خەڵکی بیگێڕیتەوە بۆیان[1].

قال همام: واللّه إني لأستحيي من اللّه أن أنظر في الكتاب، وأحفظ الحديث لكي أحدث الناس. [اقتضاء العلم العمل للخطيب]

همام دەیفەرموو: سوێند بە اللّه من شەرم دەکەم لە اللّه کە سەیری کتێب بکەم و حدیث لەبەر بکەم بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی باس بکەم و قسە بۆ خەڵکی بکەم.

---

١ - با هەم و غەمت ئەوە نەبێ ببی بە قسەکار بۆ خەڵکی و قسەیان بۆ بکەی.

وقال الوليد بن مزيد: سمعت الأوزاعي يقول: كان يقال: ويل للمتفقهين لغير العبادة. [سنن الدارمي]

الأوزاعي دەیفەرموو: سەلەف دەیان وت: هاوار بۆ ئەو کەسانەی کە طلبي عیلم دەکەن و فێردەبن بۆ غەیری عبادەت.

تێبینیەک بۆ فێرخواز ئەگەر کەسانێ هەبن سەرەتا نیەتیان نەبێ دواتر نیەتیان بۆ دروست ببێ ئەمە مەعلومە لەگەڵ جەهل و نەزانی نیەت تێک دەچێت ل گەڵ عیلم و زانست نیەت چاک دەبێت، نموونە ناهێنرێتەوە بە کەسێک کە عیلمی سەر زمانی هەیە بە هیچ کەس ناوترێت عالم ئیللا خاوەن عیلمی دڵ نەبێ وەک حسن دەیفەرموو: العلم علمان: علم باللسان، وعلم بالقلب، فعلم القلب: هو العلم النافع، وعلم اللسان: هو حجة الله على ابن آدم.
[الذل الانكسار ضمن وسائل ابن رجب]

عیلم دوو عیلمە، عیلم و زانستێک تەنها لەسەر زمانە، عیلم و زانستێکی دیکە کە لە ناو دڵە، ئەوەی لە ناو دڵە عیلمێکی نافع و بەسودە، ئەوەی لەسەر زمانە دەبێتە حوجە و بەڵگە لەسەر بەنی ئادەم لە قیامەتدا.

مەبەستی ئێمە ئەم پرسیارەی اسحاقە و ئەمە قەولی پێکراوە لە هەندێکی تر لە سەلەف سەرەتا نیەتیان نەبووە.

عن إسحاق بن راهويه قال: سألت وكيعا عن الرجل يطلب العلم ومن نيته أن يذاكر به ويحدث به أو نحو ذلك أتراه يأثم في ذلك؟ قال: لا يا ابن أخي، نا سفيان، عن حبيب بن أبي ثابت، قال: طلبنا هذا العلم وما لنا فيه نية ثم جاءت النية والعمل بعد.

امام اسحاقي کوڕی ڕاهويه دەڵێت: پرسیارم کرد لە وەکیع دەربارەی پیاوێک طلبي عیلم دەکات و لە نیەتیدا نیەتی ئەوەیە کە باسی بکات لای خەڵکی و بیگێڕێتەوە هاوشێوەی ئەمانە ئایا وای دەبینی تاوانبار بێت لەمەدا؟ وەکیع وتی: نەخێر ئەی کوڕی براکەم دواتر گێڕایەوە کە حبیبی کوڕی أبي ثابت وتویەتی: طلبي ئەم عیلمەمان کرد نیەتمان نەبوو تێیدا دواتر ئەم عیلمە ڕای کێشاین بۆ ئەوەی نیەتمان هەبێت و دواتر کار و کردەوە بە دوایدا[١].

---

١ - واتا تۆ کە زانستت هەبوو بەوەی (أول من تسعر بهم النار يوم القيامة کە ئاگری جهنم بە کێ خۆش دەکرێ و گەورەی نیەتت بۆ دەرکەوت ئەوا نیەتی دروستت دەبێ لەوەی دەیکەیت.

## النجاة في إخلاص العمل لله وترك السمعة والرياء

## تأسیری نیەتێکی باش و بوونی إخلاص بۆ دۆزینەوەی حەق و صراطي مستقیم

قال مالك بن دينار رحمه اللّه: من خلّط خلّط له، ومن صفّى صفّى له، وأقسم باللّه لئن صفيتم ليصفينّ لكم. [الإبانة الكبرى]

مالكي كوڕی دینار دەیفەرموو: هەر کەس تێکەڵی بکات تێکەڵ دەکرێت بۆی[١]، وە هەر کەس نیەتی پاك بێت ئەوا پاك دەکرێتەوە بۆی[٢]، سوێند بە الله ئەگەر ئێوە نیەتتان پاك بێت و نیەتتان هیدایەت بێت ئەوا الله ڕێنمونیتان دەکات بۆ حەق و ڕێگاکەتان بۆ پاک دەکاتەوە[٣].

---

١ - واتا: هەر کەس لە نیەتیدا تێکەڵ بێ نیەتی تەنها رەزامەندی الله نەبێت و شتی کەشی لەگەڵ بێ، ئا ئەم کەسانە ڕێگاکەیان بۆ تێکەڵ دەکرێت حەق و سوننەت نادۆزنەوە.

٢ - هەر کەس لە نیەتی تەنها ڕەزامەندی الله بێ و نیەتی دۆزینەوەی حەق و هیدایەت بێ، ئەوا الله تعالى حەقی پیشان دەدات و ڕێنمونی دەکات بۆ حەق و ڕێگاکەی بۆ پاک دەکرێتەوە.

٣ - زۆرێکمان کە حەق نادۆزینەوە هۆکار ئەوەیە نیەتێکی باشمان نییە و تێکەڵمان کردووە وەك چۆن دەوترێ (الجزاء من جنس العمل) تێکەڵ کردن تەنها نیەت نییە زۆرێک کە طلبي عیلم دەکەن هەر دەقەو لەسەر ڕێگا و مەسلەکێکە ئێوارە جۆرێکە و بەیانی جۆرێکی کە هەم نیەتت هەم واقعی ژیانت باش بکە اللّه مەخرەجت بۆ دەکاتەوە بۆ ڕزگار بوون.

## مراتب النيات الناس في طلب العلم

## يجب على طالب العلم أن يخلص نيته في طلبه

نيەتی خەڵکی لە طلبي عیلمدا جیاوازن وەک امامی بەڕێز مەیمونی کوڕی میهران لەسەردەمی خۆی ئاماژەی پێدەدات، ئەگەر بێو بگەشتبا بەم کاتەی ئێمەی تێداین بە چەند لاپەڕەیەک وشەکانی تەواو دەبوو بۆ جیاوازی خەڵکی لە طلب کردنی عیلمدا.

عن جعفر بن برقان عن ميمون قال: وإن ممن يتبع هذا العلم من يتخذه بضاعة يريد به الدنيا ومنهم من يريد أن يشار إليه ومنهم من يماري به وخيرهم الذي يتعلمه ليطيع اللّه به.

[جامع بيان العلم وفضله]

ميمون بن مهران دەیفەرموو: لەوانەی کە شوێن ئەم عیلم و زانستە کەوتوون تێیاندایە هەوڵی بەدەست هێنانی بضاعە و توجارەتێکە مەبەستی پێی دونیایە، وە هەیشە بۆ ئەوە فێر دەبێت بۆ ئەوەی ئیشارەتی بۆ بکرێ و ناسراو بێت لە ناو خەڵکیدا، کەسانێکی دیکە هەن فێری زانست دەبن بۆ ئەوەی مناقەشە و جیدالی پێبکەن، وە خەیرترینی خەڵکی لە طلبي عیلمدا ئەوانەن فێردەبن بۆ ئەوەی گوێڕایەڵی اللّه ي پێبکەن.

قال عبد الحميد بن باديس: غاية العالم المسلم أن يهتدي في نفسه وأن يهدي غيره، أما أكثر الطلاب فمنهم من تكون غايتهم الوظيفة، فهم غفلة من أنفسهم وعن غيرهم، ومنهم من تكون غايته أن ينال الشهادة بالعلم، فهو مثل الأول، فأما الغاية الحقيقية التي ذكرنا فما أقل أهلها لأنها لا ذكر لها في برامج التعليم، ولا اهتمام بها من المعلمين. وحق على كل طالب أن تكون هي غايته، لكن هذا إنما يتم للطالب إذا كان شيوخه يهتمون بهذه الغاية، ويعملون لها، ويوجهون تلامذتهم لها. وما أعز هذا الصنف من الشيوخ.

ابن باديس معصره دەڵێت: کەسی عالم و زانای موسڵمان دەبێت مەبەستی لە طلبي عيلم هيدايەتی نەفسی خۆی بێت وە هيدايەتی خەڵکی بێت، بەڵام زۆربەی فێرخواز طولابی عيلم تێیاندایە مەبەستی بە دەست هێنانی وەظيفەيە، ئەمانەش بێ ئاگايیە لە نەفسی خۆيان و غەيری خۆيشيان، وە لە طولابی عيلمدا هەندێکی تريان مەبەست يان گەيشتنە بە شەهادەيەکی عيلمی ئەميش هەر وە يەکەمە، ئەما ئامانجی سەرەکی لەوەی باسکرا هيدايەتی نەفس زۆر کەمە لەم سەردەمەدا لەبەر ئەوەی نابينی باس بکرێ لە برنامجی عيلميدا، وە گرنگی پێنادرێت لە لايەن مامۆستا کانەوە، وە حەقە لەسەر فێرخواز کە مەبەست و ئامانجی هيدايەتی نەفسی بێت، بەڵام ئەم مەبەستە کاتێ تەواو دروست دەبێ لای طالب العلم کە مامۆستاکانی گرنگی

بدەن بەم ئامانج و مەبەستە و کاری بۆ بکەن، ئاڕاستەی قوتابیە کان بۆ ئەم مەبەست ئامانجە بیّ لە طلبي زانستدا، چەند گەورەن ئەم صنفە لە مامۆستایان.

[كيف تستقيم ظل والعود أعوج]

## جمع همة النفس عليه

خاڵێکی تر لەو ڕێگایانەی کە پێویستە لەسەر فێرخواز هیمەتی ئەو فێرخوازەیە تا چەند پێداگر بێ لە بە دەست هێنانی زانست ئەوا ئەوەندە زیاتر زانست بە دەست دێنێت،
هەر کات فێرخواز لە ناو دڵیدا یەقینی بۆ دروست بوو عیلم و زانست نەجاتە لە دونیا و ئاخیرەت ئەوە هەوڵی بۆ دەدات هیچ کەسێک نییە بزانێت شتێک هەیە سودی پێدەگەیەنێت و هەوڵی بۆ نەدات مەحاڵە کەسی وا دەست بکەوێ، ئەگەر بڵێین ئەی ئەو موسڵمانەی هەوڵی بۆ نادا چی؟ دەڵێین ئەو کەسە نەگەیشتووەتە ئەو بڕوای عیلم سودی پێدەگەیەنێ، مەحاڵە کەسێک هەبێ بزانێ بە دڵنیای سود وەردەگرێ لە شتێک لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی بۆ نەدا.

رسول اللّه ﷺ دەفەرمووێت: (احْرِصْ عَلَى مَا يَنْفَعُكَ، وَاسْتَعِنْ بِاللّهِ وَلَا تَعْجِزْ). [صحيح مسلم]

پێداگربە لەسەر ئەوەی کە سودت پێ دەگەیەنێت، پشت بە اللّه ببەستە و بێ دەسەڵات مەبە[١].

١ - واتا تەمەڵ مەبە هەوڵ بدە مادەم ئەو شتە سودت پێ دەگەیەنێ، دەی طلبي عیلم هەموو خەیر و سودێکی تێدا کۆبووەتەوە.

سەیری ئەم هیمەتە بکەن لە امامی بەڕێز سوفياني الثوري: لە فەرقەدی امامي مزگەوتی بصره وە دەڵێت: چوین بۆ لای سوفیانی الثوري لە نەخۆشێکەیدا، پیاوێک لەوانەی لەگەڵمان بو حدیثێکی بۆ گێڕایەوە سوفیان سەرسام بوو بە حدیثەکەی ئازا دەستی برد بۆ ژێر جێگاکەی و ئەو تەختەی دەر کرد کە عیلمی تیا دەنوسی ئەو حدیثەی تیا نووسیەوە، پێیان وت: لەم حاڵەدا لەم نەخۆشیێدا زانست دەنوسیتەوە؟ سوفیان فەرمووی: ئەوە حدیثێکی چاک و جوانە، ئەگەر لە ژیاندا بمێنم ئەوا حدیثێکی چاکم گوێ لێبووە، ئەگەر وەفاتیش بکەم ئەوا شتێکی چاک و جوانم نوسیووە[١].

[حلية الأولياء]

قال الجنيد رحمه الله: ما طلب أحدٌ شيئاً بِجِدٍّ وصدْق إلا ناله، فإن لم ينله كُلَّه نَالَ بعضه. [الجامع لأخلاق الراوي والسامع]

الجنيد دەڵێت: هیچ کەسێک نییە هەوڵی بۆ شتێک دابێت و طلبي کردبێ بە جدی و ڕاستگۆی ئیللا گەیشتووە پێی، ئەگەر چی نەگەشتبێ بە هەمووی گەشتووە بە هەندێکی[٢].

---

١ - هیمەت لە کاتی نەخۆشیدا زۆر کەم دەکات مرۆڤ لاواز دەبێت بەڵام حقیقەت و لەزەتی عیلم لاشەی نەخۆش بێهێز نازانێ ئەو کەڵە پیاوانە لەزەتی عیلم یان کردبوو.

٢ - هەر کات فێرخواز نەیزانی دوو بابەت بە تێر و تەسەلی ظبت بکات هۆکار

سەیری هیمەتی پێشینی ئەم ئومەتە چۆن بوون لە هەوڵدانیان بۆ عیلم و زانست.

سعیدي كوڕی جوبەیر دەفەرموویێت: زۆر جار كە دەچووم بۆ لای ابن عباس بۆ ئەوەی عیلمی لێوەر بگرم، ئەو صحیفەی كە پێم بوو ئەوەندەم عیلم تیا دەنووسی هەتا پڕ دەبوو جێگای تێدا نەدەما بۆ نووسین، دواتر لە ناو نەعلەكانم هەتا ئەویش پڕ دەبوو، دواتر لە ناو دەستما[١]. [سير أعلام النبلاء]

قال سري السقطي: من عرف ما يطلب هان عليه ما يبذل.
[صفة الصفوة]

---

= ئەوەیە نە جدی بووە نە ڕاستی كردووە لە طلب كردنی عیلمدا دەنا هەر دەگەیشت بە هەندێكی.

١ - سەعیدی كوڕی جوبەیر دەزانێت بە وشك بوونی سەرچاوەكە واتا بە وەفاتی ابن عباس پێویستی دەكەوێتە ئەو كەسانەی كە زانستیان لەو وەرگرتووە یاخود ئەو زانستە هەر نامێنێ لای خەڵكی پێدا گری لەسەر زانست و عیلم بەم شێوە دەبێ ئەو كەسەی فێرخوازە دەبێ ئەم ئیمامە بەڕێزانە بكات بە قودوە هەتا جێگا نەماوە بنوسێت لە نەعلەكانی نەعل لە تەختە هەبووە لەو كاتە دواتر لە ناو لەپی دەستی نوسیوێتی.

سراي السقطي دەڵێت: هەر کەسێک ئەو شتەی هەوڵی بۆ دەدات بیناسێت و بزانێت چییە، ئاسان دەبێت لەسەری ئەو هەوڵ و ماندوو بوونەی ئەنجامی دەدات بۆی[1].

ابن القاسم دەڵێت: طلب کردنی عیلم وای کرد لە امامی مالك کە، سەقفی ماڵەکەی هەڵ بوەشێنێتەوە دارەکانی ناوی بفرۆشێت، پاشان لە دوای ئەوە ماڵی دونیا کرایەوە لەسەری[2]. [ترتيب المدارك]

شافعي لە بەسەرهاتەکەی خۆی لەسەرەتای طلبي زانستی دەڵێت: موطأم لە کەسێک وەر گرت لە خەڵکی مەکە بە ماوەی نۆ شەو لەبەرم کرد زیاتر یان کەمتر. [مناقب الشافعي للآبري]

---

١ - ئەم قسە لە ژیانی هەر یەکێک کرابێ ڕەنگە کە تۆ ئامانجێکت هەبوو هەوڵی بۆ بدەی گوێ نادەی بەو نارەحەتیانەی دەیبینی.

٢ - ئاوا طلبي زانستیان کرد بۆیە شافعي دەڵێت والی مەدینە لە ترس و هەیبەتی مالیکدا نەیدەوێرا هیچ بڵێت، هەتا والی مەدینە دەی وت زەلیلی نابینم تا ئەو کاتەی دەچمە بەردەم ماڵی مالک کە دەچمە ئەوێ ئتر زەلیل دەبم، هەیبەتی عیلم و تەقوای اللە لەو دڵەیان بو بۆیە سلطان و خاوەن دەسەڵاتیش لێیان دەترسان.

# ذم الكسل في طلب العلم

فێرخواز بیەوێت بگات بە زانست و عیلم بە مورتاحی و خۆشی پێی ناگات.

بۆیە یحیی کوڕی أبي کثیر دەیفەرموو: لا یستطاع العلم براحة الجسد. [صحیح مسلم]

عیلم و زانست بە راحەتی لاشە بە دەست نایە[١].

قال ابن الفارس:

اذا كنت تؤذى بحر المصيف

ويبس الخريف وبـرد الشـتاء

ويهليك حسن زمان الربيع

فـأخذك للعلم قل لي متى؟

[السير أعلام النبلاء]

وەک چۆن ابن الفارس دەڵێت:

ئەگەر تۆ نارەحەت بی بە گەرمای هاوین

---

١ - فێرخوازی زانست ئەگەر بێزار بێ لە گەرمای هاوین و سەرمای زستان و خەریکی سەفرە و جەو گۆڕین بێت خەوی بە دڵی خۆی بێت و نان خواردن و هەمو کاتێک لە راحەتی جەستەی بێ لا شك ئەو کەسە طالب العلم نیە با خۆیشی بە طالب العلم حساب بکات.

بـه وشـكـى پايز و ســـەرماى زســـــتان
وه بىَ ئاگات بكات جـــوانـــى بـــەهـــار
وەرگرتن و بەدەست هێنانى زانستت پێى ناڵێى كەيە؟

أبو عبيد القاسم بن سلام دەڵێت: لە دانانى ئەم كتێبە چل دانە ساڵ مامەوە يعني غريب الحديث - هەر جارێک سودێکم وەربگرتبا لە دەمى زانايانەوە ئەو سودەم دەنوسى لە جێگايەک لە ناو كتێبەكەدا، شەو دەمامەوە لە دڵ خۆشيم دا بەو فائدە و سودەى وەرم گرتووە، دواتر دەفەرمووێت بە تەلەبەكانى: ئێستاش كەسێک لە ئێوە دێت بۆ لام چوار بۆ پێنج مانگ لەلام دەمێنێتەوە دواتر دەڵێت زۆر ماو مەتەوە[١]!
[طبقات الحنابلة]

عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ قُرَّةَ قَالَ: أَشَدُّ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حِسَابًا الصَّحِيحُ الْفَارِغُ. [الزهد والرقائق لابن المبارك]

معاوية كوڕى قرة دەڵێت: قورسترين حيساب لە قيامەتدا بۆ ئەو كەسانەيە كە تەندروستن و دەست بە تاڵن[٢].

---

١ - ئێمە لەم سەردەمە دەبێت بڵێين چى.
٢ - هەردوكى دو نيعمەتى گەورەن كە بە دەست نەهێنرىَ و تەمەڵى تێدا بكرێت دەبێتە بەڵا بەسەرتەوە.

## المبادرة إلى تحصيله واغتنام سن الصبا والشباب

خاڵێکی زۆر گرنگ بۆ طالب العلم ئەم خاڵەیە: بریتییە لە پەلە کردن لە گەیشتن بە عیلم و زانست لە منداڵی و گەنجی دا.

رسول اللّه ﷺ لەو پێنج شتەی دەڵێ بیقۆزنەوە پێش لە دەست دانی یەکیان گەنجیە پێش پیری (شبابك قبل هرمك).

قال الإمام أحمد: ما شبهت الشباب إلا بشيء كان في كمي ثم سقط.

[مناقب الإمام أحمد لابن الجوزي]

امامي أحمد ئەفەرموویێت: گەنجێتیم بە هیچ شتێک بەراورد نەکردووە ئیللا بە شتێک نەبێت لە گیرفانم بووبێت و دواتر کەوتبێتە خوارەوە[١].

قال قتادة بن دعامة وغيره: العلم في الصغر كالنقش في الحجر.

[الجعديات]

قتادة و غەیری قتادە لە سەلەف دەڵێت: عیلم و زانست لە بچوکیدا وەک هەڵکۆڵینی بەردێکە وایە[٢].

---

١ - سەیری ئەم نموونەیە امامي بەڕێز دەیهێنێتەوە کەوتنە خوارەوەی شتێک لە گیرفان چەند زوو تێدەپەڕێت گەنجیش ئا بەو شێوە.

٢ - بە هیچ شتێک لاناچێت بۆیە پێداگر بە چونکە عیلم زانست لە گەورەیدا دەمێنێتەوە کە لە بچوکی لەبەر کردووە.

بۆیە علقمة دەیوت: ما حفظت وأنا شاب، فكأني أنظر إليه في قرطاس. [السير أعلام النبلاء]

ئەوەی حفظم کردووە لە گەنجیدا، ئێستا وەک ئەوە وایە سەیری بکەم لە لاپەڕە و صحیفەیەکدا[١].

ئەو کەسەی چووەتە ناو تەمەن و سوننەت و بیدعە لە یەک جیا ناکاتەوە حەق و باطل ناناسێ لەسەریێتی فێر ببێ ئێمە مەبەست مان لەوە نییە کەسی بە تەمەن دەبێ واز بهێنێت لە زانست ئەمە نموونەیە بۆ هەر کەسێک چوبێتە تەمەن.

كانَ الصَّحابي حكيمُ ابنُ حزام رَضيَ اللّهُ عَنهُ مِن ساداتُ قُريش ؛
وَكانَ يطلبُ العِلمَ عندَ الصَّحابي مُعاذ بنُ جَبل رَضيَ اللّهُ عَنهُ، كانَ أكبَر مِن مُعاذ بن جَبل بخمسينَ سَنةٍ،
فقيلُ لهُ: أنتَ تتعلَّمُ عَلى يَدِ هَذا الغُلام؟
فَقَالَ: إنَّما أهلَكَنا التَّكَبُر.
[الآدابُ الشَّرعية لابنِ مُفلِحِ]

---

١ - واتا هەموو ئەو شتانەی لەبەر چاوە کە لەبەری کردووە و گەنج بووە، بۆیە لە گەنجی عیلم ظبت دەبێ لە تەمەنی زۆر نابێ ئاگاداربە و جدی بە ان الأمر جد.

هاوەڵی بەڕێز حکیمي کوڕی حزام رضي اللّه عنه لە پیاوە گەورەکانی قورەیش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا طلبي عیلم و زانستی دەکرد لەلای هاوەڵي بەڕێز معاذي کوڕی جبل رضي اللّه عنه لە کاتێکدا پەنجا ساڵ لە معاذ گەورە تر بوو.

پێیان وت: فێری زانست دەبی لەسەر دەستی ئەو گەنجە؟
ئەم هاوەڵە بەڕێزە فەرمووی: بەڕاستی ئێمە خۆ بە گەورە زانین تووشی هەلاکەتی کردین و تیای بردین.

قال أبو الأحوص: قال لنا أبو إسحاق:یا معشر الشباب، اغتنموا يعني: قوتكم وشبابكم. [سير أعلام النبلاء]

أبو الأحوص دەڵێت: أبو إسحاق پێی دەوتین: ئەی گرۆی گەنجان بیقۆزنەوە گەنجی و هێز و تواناتان.

وكانت حفصة بنت سيرين رحمها اللّه تعالى تقول: يا معشر الشباب اعملوا فإنما العمل في الشباب. [اقتضاء العلم العمل]

حفصەی کچی سیرین دەیفەرموو: ئەی کۆمەڵەی گەنجان کار و کردەوە بکەن، بەڕاستی کار کردن لە گەنجیدایە.

وقال الشاعر:

ومَـنْ لـم يُجاهد نفسـَه وقـت الـصـِّبـا
ضـــاعـــت عــلـيـه مـراتـبُ الأخـيـــارِ

أنشد أبو عبيد اللّهً نِفْطَويه لنفسه:

أراني أنسـى مـا تعلَّمتُ فـي الكِبرْ
ولستُ بناسٍ ما تعلَّمتُ في الصِّغرْ

ومـــا العلم إلا بالتَّعلُّم في الصِّـبى
ومـــا الحلم إلا بالتَّحلُّم في الكِـبـر

ولو فُلِق القلب المُعلَّم في الصِّــبى
لأُلْفى فيه العلم كالنَّقش في الحجر

وما العلم في الشَّـيب إلا تعسُّـــفٌ
إذا كَلَّ قلب المرء والسَّـمع والبصـر

ومـا المـرء إلا اثنان: عقلٌ ومنطقٌ
فمن فاته هذا وهذا فقد دمـــــر

# ذم التسويف

خاڵێک کە شیطان زەفەری بردووە بە خەڵکی لێیوە وە طالب العلم ـیش یەکێکە لەو کەسانەی شیطان لەم دەرگاوە زەفەری پێ بردووە ئەویش دواخستنی کارەکانێتی ئەمڕۆ و بەیانی پێ دەکات هی بەیانی دەخاتە عەسر و عەسر بۆ شەو دووبارە بۆ بەیانی ئەم کەسە دەبێ چارەسەری ئەم حاڵەتە بکات دەنا بێبەش دەبێت لە زۆرێک لە زانست

اللّه جل جلاله دەفەرمووێت: ﴿وَسَارِعُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾ [آل عمران ١٣٣] دەی پەلە بکە ئەی ئیماندار بۆ لێخۆشبونی پەروردگارت و بۆ بەهەشت بۆ کەسانی بە تەقوا و خۆپارێز ئامادە کراوە.

لە ئایەتێکی تردا اللّه دەفەرمووێت: ﴿سَابِقُوا إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا كَعَرْضِ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أُعِدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ [الحديد ٢١]

عن الحسن البصريّ، قال: إياك والتسويف فإنك بيومك ولست بغدك، فإن يكن غد لك فكن في غد كما كنت في اليوم، وإن لم يكن لك غد لم تندم على ما فرطت في اليوم.

الحسن بصري دەفەرمووێت: إياك والتسويف،

ئاگاداری دواخستنی کارەکانت بە ئەمڕۆ و بەیانی پێ نەکەیت،

تۆ لە ئەمڕۆدای لە سبەینێدا نیت، وە ئەگەر سبەینێت بۆ بوو لە سبەیش کار بکەو ببە وەک چۆن لە ئەمڕۆ بویت[١]،
وە ئەگەر سبەینێت بۆ نەبوو پەشیمان نابیتەوە لەسەر ئەوەی لەمڕۆ پێشت خستووە و کردووتە.

عن أبي إسحاق، قال: قيل لرجل من عبد القيس: أوص، قال: احذروا سوف.

أبي إسحاق السبيعي دەفەرموویت: بە پیاوێک لە قەبیلەی عبد القیس وترا ئامۆژگاریمان بکە، فەرمووی: ئاگاداری دواخستنی کارەکانتان بن[٢].

عن أبي الجلد، قال: قرأت في بعض الكتب:
"إن "سوف" جند من جند إبليس".

---

١ - وا تێنەگەن ئەگەر ئەمڕۆ لاواز بووی لە کار کردن سبەی هەر وابە نا بەڵکو تێبکۆشە واتا ئەو کەسەی لەمڕۆ کاری باشی کردووە با لاواز نەبێ بەوەی کە سبەی هەیە.
٢ - ئاگاداری دواخستنی واجباتی ئەمڕۆت ئەی موسڵمان بە پلان و فێڵی شیطان فریو مەخۆ سبەی نادیارە و کەس نازانێت کە دێت جگە لە اللّه.

أبي الجلد البصري دەفەرموویت: خوێندومەتەوە لە هەندێک کتێب کە دواخستنی کار و کردەوە و ئەمڕۆ و بەیانی پێکردنی سەربازێکە لەسەربازەکانی إبليس.

عن أبي الجوزاء، ﴿وكان أمره فرطا﴾ [الكهف ٢٨] قال: تسويفا.

أبي الجوزاء: لە تەفسیری قەولی اللّه دا ﴿وكان أمره فرطا﴾ [الكهف ٢٨] دەڵێت: کارەکانیان دوا دەخست.

اللّه تعالى دەفەرموویت: لە وەصفی ئیمانداراندا ﴿يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ﴾ [المومنون ٦١] بۆ ئەنجامدانی گشت کارێکی خێر لە ناو یەکتردا بە پەلەن ﴿وَأُولَـٰئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ﴾ [آل عمران ١١٤] ئا ئەوانەن لە ڕیزی پیاوچاکاندان.

أنشدني عمر بن محمد بن أحمد:

أنت في غفلة الأمل ... لست تدري متى الأجل
لا تغرنك صحة ... فهي من أوجع العلل
كل نفس ليومها ... صبحة تقطع الأمل
فاعمل الخير واجتهد ... قبل أن تمنع العمل

[علاج التسويف]

ئەو کەسەی (موسەویفە) کار دوا دەخات و نایکات ئەم دوو ئایەتە تایبەتە بە هەر کەسێک کە وابێت بۆیە ڕەحمەتی اللّە لەو کەسەی کار دەکات بۆ ئەوەی ئەو کافر و موشریکانە دیویانە بیشزانە سەردەم سەردەمی فیتنە و کوفرە خەڵکی زۆر کەم نەجاتیان دەبێ دەی خۆت فێر بکە با بە شیرک و کوفرەوە نەگەڕێتەوە بۆ لای اللّە.

قال اللّە تعالی: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ ﴿١٠٠﴾﴾ [المومنون].

**قتادەی کوڕی دعامە** دەڵێت: ئاواتە خواز نییە بگەڕێتەوە بۆ ناو خزم و کەسوکارو خێڵەکەی، وە بۆ کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و ماڵی دونیا نییە یان شوێن هەواو ئارەزووی بکەوێ و حەزەکانی جێبەجێ بکات، نا تەنها ئاواتی ئەوەیە بگەڕێتەوە و طاعەت و عیبادەتەکانی اللّە ئەنجام بدات، دەی ڕەحمەتی اللّە لەو کەسەی ئەو کاروکردەوانە ئەنجام ئەدات کە کافرو موشریکەکان دوای مردن ئاوات ئەخوازن بگەڕێنەوە و ئەنجامی بدەن دوای ئەوەی عەزاب و سزای اللّە تعالی دەبینن بەچاوی خۆیان.

[تفسير البغوي]

## حفظ الوقت في العلم

پاراستنی کات خاڵێکی تره لەو خاڵانەی سەلەفی ئومەت لەسەری بوون لە طلبي زانستدا موسلمان دەبێت بزانێ هەر دەقەیەک لە تەمەنی کە ڕۆشت ناتوانێ بیگەڕێنێتەوە بۆیە هەتا وا گرنگیان پێداوە نان خواردن یان بە قورس زانیوە.

قال الخليل بن أحمد الفراهيدي رحمه اللّه: أَثْقَلُ سَاعَاتٍ عَلَيَّ سَاعَة آكل فِيهَا.

[الحث على طلب العلم للعسكري]

خەلیلي کوڕي أحمد دەیفەرموو: قورسترین کاتەکانم ئەو کاتەیە کە نانی تێدا دەخۆم[١].

هەندێک لە کاتی نانیش نەوەستاون

عن عُبَيْد بْن يَعِيشٍ، قال: أَقَمْتُ ثَلَاثِينَ سَنَةً مَا أَكَلْتُ بِيَدِي يَعْنِي بِاللَّيْلِ كَانَتْ أُخْتِي تُلْقِمُنِي وَأَنَا أَكْتُبُ.

[الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

---

١ - ئەونە پێداگر بووە لەسەر عیلم نان خواردنی پێ ناخۆش بووە لەبەر ئەوەی دەیوەستێنێ.

عبيدي كوڕی يعيش دەڵێت: بۆ ماوەی سی ساڵ نانم بە دەستی خۆم نەدەخوارد بە شەودا، خوشکەکەم پارووی بۆ دەکردم و من عیلم و زانستم دەنوسیەوە[١].

قال عبد الباقي البزاز: وما أعلم أني ضيعت ساعة من عمري في لهو أو لعب. [السير أعلام النبلاء]

عبد الباقي البزاز دەڵێت: نایزانم کە هیچ کاتێکم بە فیڕۆ دابێ لە تەمەنمدا لە گاڵتە و گەپ و یاریدا.

قال الحسن: ولا يلهينك المتاع القليل الفاني، فباد أجلك، ولا تقل غداً غداً، فإنك لا تدري متى إلى اللّه تصير.
[حلية الأولياء]

الحسن بصري دەيفەرموو: با ئەم خۆشیێ کەمەی ئەم دونيا فانيە بێ ئاگات نەکات، پەلە بکە لە کار کردنتدا، مەڵێ سبەی سبەی، چونکە تۆ نازانی کەی دەچیتەوە بۆ لای اللّه جل شأنه.

---

١ - نموونە بۆ هەر کەسێک بیەوێت بگات بە زانست ئا بەم طريقەيە واتای لا يستطاع العلم براحة الجسد ئەمەيە.

يا ابن آدم نهارك ضيفك؛ فلا يرحلن عنك إلا وهو راض، وكذا ليلك

هەر الحسن بصري دەیفەرموو: ئەی نەوەی ئادەم ڕۆژەکەت میوانێکە لەلات، دەی با ئەم میوانەت لێ نەڕوات ئیللا لێت ڕازی بێت، هەروەها شەوەکەیشت[١].

هەر الحسن بصري دەیفەرموو: گەیشتم بە کەسانێک هەر یەکێک لەوان پێداگرتر بو لەسەر تەمەنی وەک لە ماڵ و سامانی.

[شرح السنة البغوي]

## لزوم التأني في طلبه، وترك العجلة

پەلەنەکردن لە وەر گرتنی زانست و وەر گرتنی بە شێوازێکی تدرج و پلە بەندی خاڵێکی ترە لەو خاڵانەی دەبێت لە فێرخوازدا هەبێ، ناتوانی بگەیت بە عیلم و زانست بە جارێک، ئەمەش طريقي سەلەفە.

قال اللّه تعالى: ﴿إِنَّا سَنُلْقِي عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ [المزمل ٥]

---

١ - میوان ئەگەر بێت خزمەتی نەکەی شاهێدی باشت لەسەر نادات دەی شەو ڕۆژیش وایە کە کار و کردەوەی باشت نەکرد شاهێدی باشت بۆ نادات.

الزهري دەيفەرموو: مَنْ طَلَبَ الْعِلْمَ جُمْلَةً فَاتَهُ جُمْلَةً، وَإِنَّمَا يُدْرَكُ الْعِلْمُ حَدِيثٌ وَحَدِيثَانِ.

هەر كەس طلبي عيلم بكات بە جملە واتا بە جارێ ئەوا بە جارێ لە دەستى دەدات، بەڕاستى دەگەيت بە عيلم بە حديثێک و دوو حديث[1].

قَالَ ابْنُ عُلَيَّةَ: كُنْتُ أَسْمَعُ مِنْ أَيُّوبَ خَمْسَةً، وَلَوْ حَدَّثَنِي بِأَكْثَرَ مِنْ ذَلِكَ مَا أَرَدْتُ. [الجَامِع لأخْلَاقِ الَّراوِي وآَدابِ السَّامِع]

ابن علية دەڵێت: گويێم لە أيوب دەگرت تا پێنج حديث، ئەگەر زياترى كردبايە بۆم وەرم نەدەگرت.

قَالَ سُفْيَانُ: كُنْتُ آتِي الْأَعْمَشَ وَمَنْصُورًا، فَأَسْمَعُ أَرْبَعَةَ أَحَادِيثَ، خَمْسَةً ثُمَّ أَنْصَرِفُ، كَرَاهَةَ أَنْ تَكْثُرَ وَتَفْلِتَ.
[الجَامِع لأخْلَاقِ الَّراوِي وآَدابِ السَّامِع]

سوفيان دەفەرمووێت: دەچووم بۆ لاى الأعمش و منصور گويێم لە چوار يان پێنج حديث دەگرت لێيانەوە پاشا دەگەڕامەوە لە ترسى ئەوەى حديثەكان زۆر ببن و لە دەستم دەرچن و لام نەمێنێت.

---

١ - تۆ لە مەدارى ساڵێک ڕۆژى حديثێک لەبەر بكەى ئەخيرى ساڵ ٣٠٠ حديث زياترت لەبەرە فبتالي بتەوێ زياتريشى دەكەيت ناكرێ بە مانگێ هەزار حديث لەبەر بكەيت و دواتر واز بێنى لە ظبت كردنى.

سەیری ئەم هەمووە امامە گەورە هەموویان امام بوون لە حدیث ئاوا دەفەرموون.

قال شعبة: كُنْتُ آتِي قَتَادَةَ فَأَسْأَلُهُ عَنْ حَدِيثَيْنِ، فَيُحَدِّثُنِي ثُمَّ يَقُولُ: أَزِيدُكَ؟ فَأَقُولُ: لَا حَتَّى أَحْفَظَهُمَا وَأُتْقِنَهُمَا.الجَامِع لأخلَاقِ الرَّاوِي وآدَابِ السَّامِع

شعبة کوڕی حجاج امامی محدثین دەفەرموویت: دەچووم بۆ لای قتادة داوای دوو حدیثم لێدەکرد، حدیثەکانی پێ دەوتم پاشان قتادة دەیوت: زیاترت پێ بڵێم؟ منیش پێم دەوت: نەخێر هەتا ئەم دوو حدیثە حفظ دەکەم و اتقانی[1] دەکەم.

الزهري دەیفەرموو: ئەم عیلمە ئەگەر بتەوێ بە زۆری پێی بگەی پێی ناگەیت و زاڵ دەبێ بەسەرتدا، بەڵکو عیلم و زانست وەر بگرن لەگەڵ تێپەڕ بوونی شەو ڕۆژەکانی بە شێوازێکی لەسەر خۆو نەرم ئەو کات دەگەن بە عیلم.

[الجَامِع لأخلَاقِ الرَاوِي وآدَابِ السَّامِع]

---

١ - إتقان بەرزترین دەرەجەی حفظە وەک بڵێی نەخش لەسەر بەرد هەر کات ویستت بێتە سەر زمانت نەک بیری لێبکەیتەوە ئەوە ئیتر پاکترینی حفظە.

قال اللّه تعالى ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً ۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۖ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا﴾ [الفرقان ٣٢]

خطيب دەڵێت: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر لەسەرخۆبون و پەلەنەکردن و پلە بەندی لە طلبي عیلمدا. الفقه والمتفقه

ابن عباس رضي اللّه عنهما دەفەرموویێت: ﴿كُونُوا۟ رَبَّٰنِيِّـۧنَ﴾ [آل عمران ٧٩] ربانیِّین: ڕەبانی ئەو کەسانەن کە خەڵکی بانگ دەکەن بۆ ئەو عیلم و زانستانەی قورس نین و بچوکن دواتر فێری زانستە گەورەکانیان دەکەن[١].

[صحيح البخاري]

---

١ - ناگونجێت تۆ حدیثێکت بە سەنەد لەبەر نەبێت دەست بدەیتە مسطلحي رجال تۆ کە ناوی دو رجال نازانی ئەو مسطلحانە لەسەر کێ جێ بەجێ دەکەی؟ دەتەوێ بزانی مبهم چییە و مجهول چییە و عن عن چییە تدليس چییە کەچی ناوی بیست رجالت لە لا نییە ئەم مسطلاحانە جێبەجێ بکەی لەسەریان ئەوە لادانە لە ڕێگای سەلەف.

# الصبر في العلم

خاڵێکی تر له منهجی سەلەف بۆ فێرخواز بریتییە لە صبر گرتن وەک وتراوە (العلم يُدرك شيئًا فشيئًا، وإنَّما السَّيل اجتماع النُّقط) عیلم زانست وردە وردە پێی دەگەیت، وەک چۆن کەف کۆکراوەی نوکتە نوکتەی بچوکە، لا بد هەر کەس بیەوێت بگات بە زانست دەبێت ئارامگر بێت.

قال اللّه جل جلاله: ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ [الكهف ٢٨]

روى الأوزاعي عن يحيي بن أبي كثير: هي مجالس الفقه.

[رياضة المتعلمين، ابن السني]

يحيى کوڕی أبي كثير دەفەرمووێت: لە تەفسیری قەولی اللّه دا ﴿وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ﴾ [الكهف ٢٨] ئەوە مەجالیسی فقهە[1].

قال بعض الفقهاء: بقيت سنين أشتهي الهريسة ولا أقدر على شرائها؛ لأن وقت بيعها وقت سماع الدرس. [صيد الخاطر]

---

١ - واتا صبر بگرە لەگەڵ ئەو کەسانەی ئامادەی مەجلیسی عیلم و فقهی شەریعەت دەبن.

هەندێ لە فقاهاکان وتوویانە: ماوەی دوو ساڵ حەزم لە الهريسة[1] نەمتوانی وە بیکرِم لەبەر ئەوەی کاتی فرۆشتنی کاتی دەرس بووە.

عن الْفَضْل بْن سَعِيدِ بْنِ سَلْمٍ، قَالَ: كَانَ رَجُلٌ يَطْلُبُ الْعِلْمَ فَلَا يَقْدِرُ عَلَيْهِ فَعَزَمَ عَلَى تَرْكِهِ فَمَرَّ بِمَاءٍ يَنْحَدِرُ مِنْ رَأْسِ جَبَلٍ عَلَى صَخْرَةٍ قَدْ أَثَّرَ الْمَاءُ فِيهَا فَقَالَ: الْمَاءُ عَلَى لَطَافَتِهِ قَدْ أَثَّرَ فِي صَخْرَةٍ عَلَى كَثَافَتِهَا وَاللّهِ لَأَطْلُبَنَّ الْعِلْمَ فَطَلَبَ فَأَدْرَكَ.

[الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

لە فضل کوڕی سعیدە وە دەفەرموویێت: پیاوێک هەبوو طلبي عیلم و زانستی دەکرد، قوەتی نەدەشکا بە سەریا لە بەدەست هێنانی، بۆیە بڕیاری دا واز بهێنێت لە طلب کردنی عیلم، ئەم پیاوە تێدەپەڕێت بە لای ئاوێکدا لەسەر شاخێکەوە دێتە خوارەوە دەکەوێتە سەر بەردێک سەیر دەکات جێگای ئاوەکە لەسەر بەردەکە دەرکەوتووە و چاڵی کردووە، لەو کاتە پیاوەکە وتی: ئاو بەو نەرمێی کە هەیەتی جێگای خۆی دیاری کردووە لەسەر بەردێک بەو ڕەقیە، پیاوەکە لەویا سوێن دەخوات: دەڵێت سوێند بە اللّه دەبێ طلبي عیلم و زانست بکەم، طلبي کرد و پێی گەیشت.

---

١ - بووە جۆرێکە لە خواردن وەک حەلْوا وایە.

أحمدي كوڕی حنبل رحمه اللّه: ابو الحجاج المزي له ترجمەی ئیمامی بەڕێز هێناویێتی دەفەرموویێت: ئەگەر پەنجا درهەمم هەبوایە دەچووم بۆ لای جريري كوڕی عبد الحميد بۆ الري، هەندێک لە هاوەڵەکانمان چوون من توانام نەبوو بچم بۆ لای لەبەر ئەوەی هیچ درهەم و پارەیەکم لا نەبوو پێی بچم.

[تهذيب الكمال]

هەر لە ترجمەکەی دەڵێت: أحمدي كوڕی حنبل بەپێ دەچوو بۆ طەرەسوس لەبەر بێ توانای مەسروفی ڕێگا پارەی سەفەری پێنەبوو.

[تهذيب الكمال]

ابن رافع دەڵێت: أحمدی كوڕی حنبلم بینی لە مەکە لە دوای گەڕانەوەی لە یەمەن قاچەکانی شەق شەق ببوون و هیلاکی و ماندووی پێوە دیار بوو.

[تهذيب الكمال]

---

١ - بۆیە دەیفەرموو: مع المحبرة إلى المقبرة" رحمة اللّه عليه ورحم دەبێت فێرخواز چاو لەم پیاوە گەورانە بکات بۆ ئەوەی لانی کەم صبر بە بیر خۆی بێنێتەوە.

قال الإمام الشافعي: يحتاج طالب العلم إلى ثلاث خصال: أولها: طول العمر، والثاني: سعة ذات اليد، والثالث: الذكاء.

[كتاب مناقب الشافعي]

امامی شافعی دەفەرموویت: طالبي عيلم پێویستی بە سێ شت هەیە بۆ ئەوەی بگات بە عیلم: یەکەم: تەمەن درێژی[1] وە دووەم: دەوڵەمەندی، وە سێیەم: زیرەکی و ژیری.

## (درة شافعية) طلب التوفيق من الله في طلب العلم، والصبر عليه.

## داوا کردنی تەوفیق لە الله جل جلاله لە طلبي عيلمدا

قَالَ الإمامُ محمَّدُ بنُ إدريس الشَّافعي رحمه اللّه: وَالنَّاسُ فِي العِلْمِ طَبَقَاتٌ، مَوقعُهم مِنَ العِلْمِ بِقَدرِ دَرَجَاتِهم فِي العِلْمِ بِهِ.
فَحقٌّ عَلَى طَلَبَةِ العِلْمِ بُلُوغُ غَاية جَهْدِهم فِي الاسْتِكْثَارِ مِنْ عِلْمه وَالصَّبرِ عَلَى كُلِّ عَارِضٍ دُونَ طَلَبه، وَ إِخْلَاصِ النِّيَّةِ لِلّهِ فِي اسْتِدْرَاكِ عِلْمهِ، نَصّاً وَ اسْتِنْبَاطَاً، وَالرَّغْبة إلَى اللّه فِي العَوْنِ عَليهِ؛ فَإنَّه لاَ يُدْرَكُ خَيْرٌ إلاَّ بِعَونه

١ - امام مەبەستی بەردەوام بوونە تەمەنی زۆر لە ناو عیلمدا واتا صبر.

فَإنَّ مَنْ أَدْرَكَ عِلْمَ أَحْكَامِ اللّه فِي كِتَابِهِ نَصَّاً وَاسْتِدْلاَلاً، وَوَفَّقهُ اللّه لِلْقَولِ وَالعَمَلِ بِمَا عَلِمَ منْهُ: فَازَ بِالفَضِيْلَةِ فِي دِيْنهِ وَ دُنْيَاهُ، وَانْتَفتْ عَنْهُ الرِّيَبُ، وَنَوَّرتْ فِي قَلْبهِ الْحِكْمَةُ، وَاسْتَوجبَ فِي الدِّينِ مَوْضِعَ الإِمَامَةِ.

[الرِّسالَة]

امامي بەڕێز إمامي شافعي رحمه اللّه دەفەرموویێت: خەڵکی لە عیلم و زانستدا چەند دەرەجە و طەبەقەیەکن، مەکانەت و پێگەیان لە عیلم و زانستدا دیاری دەکرێت بە ئەندازەی ئەو عیلمەی کە لە لایانە، حەقە و پێویستە لەسەر طالب العلم بە تەواوی جوهدی خۆی بخاتە کار بۆ بە دەست هێنانی زانستی زیاتر و زۆرتر وە ئارام بگرێت لە بەرامبەر هەموو ئەو نارەحەتیانەی دێنە ڕێی لە طلب کردنیدا، حەقە لەسەر طالبي عیلم کە إخلاصي هەبێت لە بەدەست هێنانی عیلمدا لە ڕووی دەقەکانەوە بێت یاخود استنباط بێت لە حوکمێک، وە بگەڕێتەوە بۆ لای اللّه جل جلاله بۆ ئەوەی یارمەتی بدات لە طلب کردنی عیلم و زانستدا، لەبەر ئەوەی خەیر بە دەست نایەت و پێی ناگەیت ئیللا بە یارمەتی و تەوفیقی اللّه نەبێت، هەر کەسێک عیلم و زانست بە دەست بهێنێت لە لە أحکامدا لە قورئاندا لە ڕووی نص و استدلال چۆنێتی دەلیل هێنانەوە، وە اللّه تەوفیقی بدات کردار و گوفتاری لەسەر عیلم و زانست بێت، ئەوا ئەو کەسە لە دین و

دونیایدا سەرکەوتووبووە و فضیلەی و پێگەی بە دەست هێناوە، لە دوو دڵی و دڵە ڕاوکێیدا نامێنێت، وە دڵکەی ڕۆشن و ڕووناک بووەتەوە بە عیلمی شەرعی وە لە دینیشدا ئەو کەسە پێگەی إمامەت بە دەست دەهێنێت.

## بذل الجهد في تحفظ العلم

خاڵێک دەکرێت بڵێین عیلمی تێدا کۆ بووەتەوە ئەویش بریتییە لە حفظ کردن و لە بەرکردنی عیلم و زانست بە هیچ کەسێک ناوترێت عالم و زانا حافظ نەبێ لابد دەبێ حفظي هەبێت.

قال يَمُوتَ بْنَ الْمُزَرِّعِ الْعَبْدِيَّ: لَيْسَ الْعِلْمُ مَا حَوَاهُ الْقِمَطْرُ إِنَّمَا الْعِلْمُ مَا حَوَاهُ الصَّدْرُ. [الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

يموتي کوڕی المزرع دەڵێت: عیلم و زانست نییە ئەوەی لە دوو توێی کتێبدایە، عیلم ئەوەیە کە لە سنگدایە[١].

قال الْأَصْمَعِيَّ: كُلُّ عِلْمٍ لَا يَدْخُلُ مَعِي الْحَمَّامَ فَلَيْسَ بِعِلْمٍ.
[الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

الأصمعي دەلێت: هەر عیلمێک لەگەڵم نەیەتە حەمام ئەوە بە عیلم حساب ناکرێ[٢].

---

١ - واتا ئەوەی کە لە حفظدایە ئەوە عیلمە.

٢ - ئەمە اتفاقی لەسەرە قەولی هەندێکی ترە لە سەلەف.

قَالَ ابْنُ يَسِيرٍ الْأَزْدِيُّ: في البحر المتقارب

أَأَشْهَدُ بِالْجَهْلِ فِي مَجْلِسٍ
وَعِلْمِي فِي الْبَيْتِ مُسْتَوْدَعُ
إِذَا لَمْ تَكُنْ حَافِظًا وَاعِيًا
فَجَمْعُكَ لِلْكُتُبِ لَا يَنْفَعُ

ئايا شاهێدی بدەم بە نەزانی خۆم لە کۆڕ و مەجلیسدا
عیلم و زانستەکەشم لە ماڵەوە جێهێشتبێ
ئەگەر تۆ حافظێکی تێگەشتوو نەبیت
کۆکردنەوەی کتێبت هیچ سودێکی نییە بۆت
[الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

نصيحة مختصرة في بيتين؛ لمن يظنُّ أن العِلم هو جَمعُ المَال والكُتُب:

يَا مَنْ يَرَى الْعِلْمَ جَمْعَ الْمَالِ وَالْكُتُبِ
خُدِعْتَ وَاللّٰهِ لَيْسَ الْجِدُّ كَاللَّعِبِ
الْعِلْمُ وَيْحَكَ مَا فِي الصَّدْرِ تَجْمَعُهُ
حِفْظًا وَفَهْمًا وَإِتْقَانًا فِدَاكَ أَبِ.

ئـەی ئـەو کەســەی وا دەزانی عیلم کۆکردنـەوەی ماڵ و کتێبە هەڵخەڵەتاوی سوێند بە اللّە جدی بوون و گاڵتە کوا وەک یەکە هاوار بۆ تۆ عیلم و زانسـت ئەوەیە کە لە سـنگدا کۆکراوەتەوە بـــە حـــیفظ و تێگەشـــتن و اتقانەوە باوکم بەســاقەت بێت.

قال القاسم بن الخلاد: الاحتفاظ بما في صدر الرجل أولى من درس دفتره، وحرف تحفظه بقلبك أنفع لك من ألف حديث في دفاتر.

[الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

القاسمي کوڕی الخلاد دەڵێت: پاراستن و حفظ کردنی ئەوەی لە سنگدایە ئەولاترە وەک لە دەرسی سەر دەفتەر، یەک حەرف حفظي بکەیت بە دڵت بەسودترە بۆت لە هەزار حدیث لە دەفتەر و کتێبدا.

أَنْشَدَنِي عُبَيْدُ اللّهِ بْنُ أَحْمَدَ الصَّيْرَفِيُّ: البحر الرجز

لَيْسَ بِعِلْمٍ مَـا حَوَى الْقِمَطْرُ
مَـا الْعِلْمُ إِلَّا مَا حَوَاهُ الصَّدْرُ
فَـــذَاكَ فِـيـهِ شَـرَفٌ وَفَـخْـرُ
وَزِيــنَــةٌ جَـلِـيـلَـةٌ وَقَـــــدْرُ

[الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

وقال الإمام الحنبلي ابن بطة العكبري صاحب الإبانة لجلسائه: هذا مسند أحمد؛ يأخذ أحدكم أي جزء شاء، ويقرأ علي الإسناد لأذكر المتن، أو المتن لأذكر الإسناد.

[طبقات الحنابلة]

ابن بطة: بەو کەسانەی دەوت کە هاو مەجلیسی بوون، دەیوت ئەوە موسنەدی امام أحمدە یەکێک لە ئێوە بە ویستی خۆی بەشێکی ببات و ئیسنادی فەرموودەکەم بەسەردا بخوێنێتەوە منیش مذاکرەی مەتنەکەی دەکەم و دەیخوێنمەوە، یان مەتنەکەی بخوێنە من مەتنی فەرموودەکە دەخوێنم[1].

---

١ - حفظ ئاوا دەبێت ئا بەوە دەوترێت اتقان.

## المذاكرة العلم عند الأوائل

## مُذَاكرة المَحفوظ أولى مِن الحفظ الجديد

مذاكره بريتييه له هێشتنەوەی بەرووبوومی ماندو بونت واتا تۆ كه حيفظ دەكەی هەر كەسێک و حفظی بە جۆرێکە کەسی وا هەیە بە جارێک لەبەری دەکات هەیشە پەنجا جار و سەد جار، ئەم ماندو بوونە بە چی بەرووبوومی دەبینی؟ مذاكره و دووبارە خوێندنەوە بەرووبوومی ماندو بوونەکەت بۆ دەهێڵێتەوە لەسەر ئەم بابە قسەی زانایان هێندە زۆرە بیهێنین توشی ملل مان دەکات هەوڵ دەدەین بە پوختی تەواوی بکەین:

فێرخواز دەبێ بزانێ پارێزگاری کردنی لەوەی لەبەری کردووە و ماندو بووە پێی وە ئەولاترە لە حيفظ کردنی شتانێکی تازە.

عَنِ الْخَلِيلِ بْنِ أَحْمَدَ، قَالَ: تَعَهَّدُ مَا فِي صَدْرِكَ أَوْلَى بِكَ مِنْ تَحَفُّظِ مَا فِي كُتُبِكَ.

[الجامع للخطيب]

خەليلي كوڕی أحمدي الفراهدي دەڵێت: مذاكره بكە و زياتر گرنگی بدە بەوەی كە لە سنگتدایە ئەولا ترە بۆت وەک لە حيفظ کردنی ئەوەی لە کتێبە کەتدایە.

قال أبو عبد الله جعفر بن محمد: القلوب ترب، والعلم غرسها، والمذاكرة ماؤها، فإذا انقطع عن الترب ماؤها جف غرسها.

[الجامع لأخلاق الراوي]

أبو عبد الله جعفري كوڕی محمد دەڵێت: دڵ هاوشێوەی خاك و گڵە، وە عیلم و زانستیش ئەو چێنراوەیە کە چاندووتە، وە مذاکرە کردن و موراجعە کردنیش ئاوە بۆ ئەوەی چاندووتە، هەر کاتێک ئاوت گرتەوە لە گڵەکە ئەوا ئەو نەمامەی چاندووتە وشک دەکات[١].

عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال: تَحَدَّثُوا فَإِنَّ الْحَدِيثَ يُهَيِّجُ الْحَدِيثَ.

[المصنف ابن ابي شيبة]

ابي سعيد الخدري رضي الله عنه دەفەرموویت: حدیث بگێڕنە و موراجەعەی بکەن لەبەر ئەوەی ئەو حدیثانەی دەیگێڕنەوە هەندێک لە حدیثی تر دەجوڵێنێت.

وعن علي بن أبي طالب رضي الله عنه قال: تَزَاوَرُوا وَتَذَاكَرُوا الْحَدِيثَ، فَإِنَّكُمْ إِنْ لَمْ تَفْعَلُوا يَدْرُسْ.

[المصنف ابن ابي شيبة]

---

١ - بتالي ئەمە شتانێکی زۆر دێت وەلەو تەنها ئەمە کافیە بۆ فێرخواز.

امامي علي رضي الله عنه دەفەرموویت: سەردانی یەکتر بکەن و مذاکرەی حدیث بکەن لە کاتی سەردانی کردنتاندا، ئەگەر بێو وا نەکەن ئەوا حدیث لە دەس دەچێت و نامێنێت.

عن الأعمش قال عن إسماعيل بن رجاء: أَنَّهُ كَانَ يَأْتِي صِبْيَانَ الْكُتَّابِ، فَيَعْرِضُ عَلَيْهِمْ حَدِيثَهُ كَيْ لَا يَنْسَى.

[المصنف ابن ابي شيبة]

لە الأعمش ـەوە دەڵێت: اسماعیل کوڕی رجاء دەڕۆشت بۆ لای منداڵانی فێرگە، لەوێ دەستی دەکرد بە گێڕانەوەی حدیث بەسەر منداڵەکاندا بۆ ئەوەی ئەو حدیثانەی لە لایەتی لە بیری نەچێتەوە[1].

قال إبراهيم الأصبهاني: كل من حفظ حديثًا فلم يُذاكر به، تفلت منه.

[الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع]

ابراهیم الأصبهاني دەڵێت: هەر کەسێک حیفظی حدیث بکات و مذاکرەی نەکات، ئەوا حدیثي لا نامێنێت و دەر دەچێ لە دەستی.

---

١ - واتا مذاکرەی بۆ خۆی کردووە لەگەڵ منداڵاندا دەی ئەگەر ئێمەش هەر کەس نەبێ لەگەڵ ماڵ و منداڵ و منداڵی چواردەوردا دەتوانین مذاکرە بکەین.

٢ - مذاکرە: واتا لەگەڵ کەسێک ئەو بیخوێنێتەوە بەسەرتدا تۆ بیخوێنیتەوە بەسەر ئەودا یاخود تەنها خۆت بە دەنگێک گوێت لە خۆت بێ باشترە حدیثەکان بخوێنیتەوە بەو شێوازە حدیث دەمێنێتەوە.

قال الخطيب: إذا لم يجد الطالب من يُذاكره، أدام ذكر الحديث مع نفسه، وكرَّره على قلبه؛ الجامع الأخلاق الراوي وآداب السامع

خطيب دەڵێت: ئەگەر کەسی طالب العلم کەسی دەست نەکەوت مذاکرەی لەگەڵ بکات، با بەردەوام بێ لە مذاکرە لەگەڵ نەفسی خۆیدا، دووبارەی بکاتەوە لە دڵیدا جار لە دوای جار.

قاعدة الحفظ:

مـــــــا تــكــرَّر، تــقـرَّر

ويثبُتُ الحفظُ إذا تـكرَّرَا

فــإنّ مــا كـرَّرْتَهُ تـقرَّرَا

ئەمە قاعدەیە لە حفظدا:

چەند زیاتر دووبارە بکرێتەوە زیاتر جێگیر دەبێت.

سئل البخاري: عن دواء للحفظ فقال: إدمان النظر في الكتب.

[جامع بيان العلم وفضله]

پرسیار کرا لە البخاري دەربارەی عیلاجی حفظ: لە وەڵامدا وتی: بەردەوام بوون لە سەیرکردنی کتێب.

---

١ - واتا بە بەردەوامی سەیری ئەوە بکەیتەوە کە حفظت کردووە.

وقال أحمد بن الفرات: أجمعوا أنه ليس شئ أبلغ في الحفظ إلا كثرة النظر. [جامع بيان العلم وفضله]

أحمدي كوڕی الفرات دەڵێت: جیاوازی نییە لە نێوان زانایان کە هیچ شتێک نییە بتگەیەنێت بە حفظ ئیللا زۆر سەیرکردنی کتێب نەبێت.

عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: تَذَاكَرُوا هَذَا الْحَدِيثَ لَا يَنْفَلِتْ مِنْكُمْ؛ فَإِنَّهُ لَيْسَ مِثْلَ الْقُرْآنِ مَجْمُوعٌ مَحْفُوظٌ، وَإِنَّكُمْ إِنْ لَمْ تَذَاكَرُوا هَذَا الْحَدِيثَ يَنْفَلِتْ مِنْكُمْ، وَلَا يَقُولَنَّ أَحَدُكُمْ: حَدَّثْتُ أَمْسِ فَلَا أُحَدِّثُ الْيَوْمَ. بَلْ حَدِّثْ أَمْسِ، وَلْتُحَدِّثِ الْيَوْمَ، وَلْتُحَدِّثْ غَدًا. [سنن الدارمي]

ابن عباس رضي الله عنهما دەفەرموویێت: مذاکرەی ئەو حدیثانە بکەن لەبیرتان ناچێو لە دەستان بچێت، حدیث وەک قورئان نییە کۆکرابێتەوە لە مصحفدا پارێزراو بێ، ئەگەر ئێوە مذاکرەی حدیث نەکەن ئەوا لە دەستان دەچێت و دەڕوات، با هیچ یەکێک لە ئێوە نەڵێت: دوێنێ مذاکرەم کردووە ئەمڕۆ مذاکرە ناکەم، بەڵکو دوێنێ موراجعە و مذاکرەت کردووە، ئەمڕۆش بیکەوە، وە سبەینێش هەر موراجعە بکە.

---

١ - لەگەڵ واز هێنان لە مراجعە حدیث دەڕوا و نامێنێ بەرو بومی ماندو بونت لە دەست دەچێت مذاکرە وەک حیفظ نییە یەک جار بیخوێنەوە تازە دەبێتەوە هەر مەجالت نیە بە دەنگ واتا دەنگی خۆت تسجیل بکەو بە سماعە با لە گوێت بێت.

عَنْ زِيَادِ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ شِهَابٍ يُحَدِّثُ الْأَعْرَابَ.

[سنن الدارمي]

زيادي كوڕی سعد دەڵێت: ابن شيهابي الزهري دەچوو حديثی بۆ ئەعرابيەکان دەگێڕايەوە بۆ مذاکرە کردنی خۆی.

عَنْ عَطَاءٍ وَطَاوُسٍ وَمُجَاهِدٍ قَالَ عَنِ اثْنَيْنِ مِنْهُمْ: لَا بَأْسَ بِالسَّمَرِ فِي الْفِقْهِ. [سنن الدارمي]

لە عطاء و طاوس و مجاهد ياخود لە دوانيان: دەيان فەرموو: شەو نخونی کردن لە فقه و طلبي عيلمدا هيچ کێشەی تێدا نييە.

قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: تَدَارُسُ الْعِلْمِ سَاعَةً مِنَ اللَّيْلِ خَيْرٌ مِنْ إِحْيَائِهَا. [سنن الدارمي]

ابن عباس رضي اللّه عنهما دەفەرموويێت: مذاکرە کردنی عيلم و زانست لە بەشێک لە شەودا چاکتر و باشترە لە زيندو کردنەوەی ئەو بەشەی شەو بە شەو نوێژ کردن.

---

١ - ئەعرابی بە ئەهلی لادێ دەوترێت لە زمانی عرەبی ئەو کەسانەی کە لە شار نين و لە لادێن.

عَنْ عَوْنٍ قَالَ: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لِأَصْحَابِهِ حِينَ قَدِمُوا عَلَيْهِ: هَلْ تَجَالَسُونَ؟ قَالُوا: لَيْسَ نَتْرُكُ ذَاكَ. قَالَ: فَهَلْ تَزَاوَرُونَ؟ قَالُوا: نَعَمْ يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ، إِنَّ الرَّجُلَ مِنَّا لَيَفْقِدُ أَخَاهُ فَيَمْشِي فِي طَلَبِهِ إِلَى أَقْصَى الْكُوفَةِ حَتَّى يَلْقَاهُ. قَالَ: فَإِنَّكُمْ لَنْ تَزَالُوا بِخَيْرٍ مَا فَعَلْتُمْ ذَلِكَ.

[سنن الدارمي]

عون دەڵێت: لەو کاتەی هاوەڵەکانی عبد اللّه کوڕی مەسعود هاتن بۆ لای عبد اللّه پێی وتن: ئایا ئێوە دادەنیشن و کۆببنەوە؟ وتیان بەڵێ: ئێمە ئەم دانیشتن و مەجلیسانە واز لێناهێنین. دواتر فەرمووی ئەی سەردانی یەکتر دەکەن؟ وتیان: بەڵێ ئەی باوکی عبدالرحمن، هەتا کەسی وا هەیە لە ئێمەدا ئەگەر براکەی دیار نەمێنێ ئەڕوا بە دوای هەواڵیدا هەتا ئاخیری شاری کوفە تاوەکو پێی نەگات ناگەڕێتەوە، عبد اللّه کوڕی مەسعود فەرمووی: دەی بەڕاستی بەردەوام لە خێردان مادام ئاوا کۆببنەوە و گەرمو گوڕ بن لە ناو یەکدا.

---

١ - ئەم باسە امامی دارمی لە ژێر ناو نیشانی مذاكرة العلم هێناویێتی ئەمەش صیناعەی ئەهلی حدیثە بە تبویبات ـتێت دەگەیەنن رحمهم اللّه کەواتە کۆبوونەوە بۆ موراجعە و باس کردنی عیلم مەبەستە لەم بابە، مەجالیسی ئێساش هەر وەک خەڵکەکەیەتی هەموو باسی دونیاوی تێدایە جگە لە عیلم و زانست.

عَنِ الْحَسَنِ قَالَ: غَائِلَةُ الْعِلْمِ النِّسْيَانُ. [سنن الدارمي]

الحسن بصري دەڵێت: تیاچوون و نەمانی عیلم و زانست بە سەبەبی لەبیر چونەوەیە.

قَالَ الزُّهْرِيُّ: كُنْتُ أَحْسَبُ بِأَنِّي أَصَبْتُ مِنَ الْعِلْمِ، فَجَالَسْتُ عُبَيْدَ اللّهِّ، فَكَأَنِّي كُنْتُ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ.
[سنن الدارمي]

الزهري دەڵێت: من وام دەزانی ڕێژەیەکی باشم لە لایە لە عیلم، کاتێک کە دانیشتم لەگەڵ عُبَيْدَ اللّهِّ بۆم دەرکەوت من جۆگەیەکم لە جۆگەکان لە چاو ئەودا[١].

عن سعيد بن جبير، عن ابن عباس: قال كان يقول: يا سعيد اخرج بنا إلى النخل ويقول: يا سعيد حدث قلت: أحدث وأنت شاهد؟ قال: إن أخطأت فتحت عليك. [الجامع لأخلاق الراوي]

سعیدی کوڕی جبیر دەڵێت: ابن عباس پێی دەوتم با بچین بۆ ئەو باخە خورمایە، دواتر پێی دەوتم ئەی سعید: حدیث بگێڕەوە، منیش وتم حدیث بگێڕمەوە لە کاتێک تۆ لێرا بی؟

---

١ - شعب واتا ئەو جۆگا و ڕێگایانەی بە ناو شاخ و دۆڵەکاندا دێتە خوار واتا لە چاو ئەو زانستە زۆرەی لای بووە هۆکار مذاکرەی بووە.

ابن عباس فەرمووی: ئەگەر غەڵەتت کرد بە بیرت دەهێنمەوە.

عن إبراهيم النخعي قال: إِذَا سَمِعْتَ حَدِيثًا، فَحَدِّثْ حِينَ تَسْمَعُهُ وَلَوْ أَنْ تُحَدِّثَ مَنْ لَا يَشْتَهِيهِ، وَإِنَّهُ يَكُونُ كَالْكِتَابِ فِي صَدْرِكَ.
[المصنف ابن ابي شيبة]

إبراهيمي النخعي دەفەرموویێت: هەر کاتێک حدیثێکت وەرگرت، ئەوا بیگێڕەوە بۆ کەسانی تر لەو کاتەی وەرت گرتووە و گوێبیستی بووی، ئەگەر چیش بۆ کەسێکی بگێڕیتەوە کە حدیثی ناوێ ئەوا هەر بۆی باس بکە، لەبەر ئەوەی باسی بکەیت و مذاکرەی بکەیت ئەوا وەک کتێبێک وایە لە سنگتدا بێت[1].

قال علي بن المديني: ستة كادت تذهب عقولهم عند المذاكرة: يحيى وعبد الرحمن ووكيع وابن عيينة وأبو داود وعبد الرزاق قال علي: من شدة شهوتهم له. [الجامع لأخلاق الراوي]

علي کوڕی المديني دەڵێت: شەش کەس لەبەر ئەو حەزە زۆرەی بۆ مذاکرە هەیان بوو خەریک بوو عەقڵیان لە دەست دەدا لەبەر مذاکرە ئەوانیش بریتیین لە: يحيى، و عبد الرحمن، و وكيع، و ابن عيينة، و أبو داود، و عبد الرزاق.

---

١ - واتا ئەگەر کەست دەست نەکەوت حدیثی بۆ بگێڕیتەوە ئنجا بۆ ئەو جۆرە کەسانەی بگێڕەوە.

## حلاوة العلم والمذاكرة خير من حلاوة الوزارة، قصة الطبراني مع الجعابي

عن أبا الحسين بن فارس اللغوي، يقول: سمعت الأستاذ ابن العميد يقول: ما كنت أظن أن في الدنيا حلاوة ألذ من الرئاسة والوزارة التي أنا فيها حتى شاهدت مذاكرة سليمان بن أحمد الطبراني وأبي بكر الجعابي بحضرتي فكان الطبراني يغلب الجعابي بكثرة حفظه وكان الجعابي يغلب الطبراني بفطنته وذكاء أهل بغداد حتى ارتفعت أصواتها ولا يكاد أحدهما يغلب صاحبه فقال الجعابي: عندي حديث ليس في الدنيا إلا عندي فقال: هاته فقال: نا أبو خليفة نا سليمان بن أيوب وحدث بالحديث فقال الطبراني: أنا سليمان بن أيوب ومني سمع أبو خليفة فاسمع مني حتى يعلو إسنادك فإنك تروي عن أبي خليفة عني فخجل الجعابي وغلبه الطبراني، قال ابن العميد: فوددت في مكاني أن الوزارة والرئاسة ليتها لم تكن لي وكنت الطبراني، وفرحت مثل الفرح الذي فرح به الطبراني لأجل الحديث.

[الجامع لأخلاق الراوي]

أبا الحسين بن فارس اللغوي دەڵێت: ابن العميد دەيوت[1]: وا گومانم نەبردبوو لە دونيادا خۆشی هەبێ خۆشتر بێ لە گرتنە دەسی دەسەڵات و ئەو وەزارەت و پۆستەی کە منی تێدام، هەتا ئەوەی کە بينيم لە مذاکره لە نێوان سليمانی کوڕی احمد الطبراني، لەگەڵ ابي بكر الجعابي، دەمبينی طبرانی زياتر پێش دەکەوت بەسەر جعابيدا بە زۆری حيفظەکەی بۆ حديث،

وە جعابي پێش دەکەوت بەسەر طبرانی دا بە فطنه و زيرەکێکەی، تا دەبينێت سەوت بەرز دەبێتەوە و نەيان دەتوانی يەک ببەزێنن لە مذاکره، لەو کاتەدا جعابی وتی: حديثێکم لەلايە لە دونيادا ئەو حديثە نييە تەنها لای من نەبێ،

طبرانيش دەڵێت: حديثەکە بێنە،

الجعابي دەڵێت: حدثنا ابو خليفة حدثنا سليمان بن ايوب و حەديثەکە دەگێڕێتەوە،

ئا لەو کاتەدا طبراني دەڵێت: من سليماني کوڕی أيوب ـم لە سەنەدەکەدا وە ابو خليفة لە منۆ حديثەکەی بيستووە، دواتر طبراني پێی دەڵێ حديثەکە لە منەوە ببيستە بۆ ئەوەی ئيسنادەکەت عالی ببێت، تۆ ڕيوايەتوو کرد لە ابو خەليفە ئەويش لە منەوە، ابن العميد

---

١ - يەکێکە لە کار بەدەستان.

لەو کاتەدا ابن العمید دەڵێت: لەو جێگادا تەمەنای ئەوەم ئەکرد نە وەزارەت و نە پلە و پۆست هی من بوایە هیچ شتێکم بە دەست نەبوایە، بەس من طبراني بوومایە وە تەمەنای ئەوەم دەکرد هیچ دەسەڵاتم نەبوایە بەس هاوشێوەی دڵ خۆشێکەی طبراني دڵ خۆش ببومایە لەبەر مذاکرەی حدیث و حدیث کە دڵخۆشی کرد[١].

١ - ئەمەش ثمەرەی عیلم و حدیث کار بەدەست و ئەوانەی ماڵی دونیایان هەیە تەمەنا دەکەن وەک ئەوان دڵخۆش بن.

# أهمية المطالعة لطلاب العلم

## گرنگی مطالعه کردن بۆ طالب العلم خوێندنەوەی جار لە دوای جار و بحث کردن بە دوای زانستدا

قال ابن باديس: فهم قواعد العلم وتطبيقها حتى تحصل ملكة استعمالها هذا هو المقصود من الدرس على الشيوخ، فأما توسيعُ دائرة الفهم والاطلاع فإنما يُتوصل إليها الطالب بنفسه بمطالعاته للكتب ومزاولته للتقرير والتحرير.

[آثار ابن باديس]

ابن باديس دەڵێت: تێگەشتن لە قواعد و بناغەی عیلم و زانست وە چۆنێتی تطبیق کردنی قاعدەکان هەتا ئەو کاتەی طالبي عیلم دەگات بە مەلەکەیەک و سەرەتایەک بە دەست بێنێت بۆ ئەوەی قاعدەکان دابەمەزرێنێت لەسەری و کاری لەسەر بکات ئەمە مەبەستە لە دەرس خوێندن لە لای مامۆستایان[1] ئەما وەرگرتنی عیلم و فەهمێکی فراوان و زۆر مطالعەیەکی زۆر، ئەمە طالبي عیلم بە نەفسی خۆی دەبێ خۆی ماندو بکات و پێی دەگات بە زۆر خوێندنەوەی جار لە دوای جاری کتێبەکان وە بەراورکردنی و لێکدانەوەی کتابەکان لەگەڵ یەکدا،

---

١ - تەنها کەوتنە سەر ڕێگاکە و بنچینەی کارەکە.

دواتر دەڵێت: دەرس خوێندن لای شیخ و مامۆستا کەمێک لە قاعدە و ڕێسا و یاسای عیلمی تیا بە دەست دێت، زۆر باب لە بابە جیا جیاکانی عیلم هەیە دەمێنێت، طالب العلم پێی دەگات بە ماندو بوون و مطالعە کردن و هەوڵی خۆی، بۆیە لەو ماوەی لەگەڵ مامۆستاکەی مطالعە دەکات بەردەوام دەبێ لە خوێندنی جار لە دوای جار دەبینێت دەستەکەوتی عیلمی ئێجگار فراوان دەبێت[١].

١ - بۆیە دەبینرێت کەسانێک چەنەهای ساڵە خەریکن ناتوانن دوو بابەت بە جوانی طرح بکەن و ناتوانن بە باشی دوو کەس تێبگەیەنن ئیللا اسقاطی دەکەن و شەلی دەکەن هۆکار ئەوەیە لای نەداوە لە منهجیەتی شێخەکەی و لەسەر ئەو ڕێگای ئەو ڕۆشتووە و بۆ خۆی ئاوا ماڵ وێران و ئەو هەمووە کاتەی بە فیرۆ چووە.

## ملازمة آداب العلم

بەڵێ پێویستە لەسەر کەسی فێرخواز دووربکەوێتەوە لە هەر خورەوشتێک کە لەگەڵ عیلم و زانستدا ناگونجێت، کەسێک ناگونجێت بۆ عیلم و زانست ـوە زانست ـیش لەگەڵ ئەو کەسە ناگونجێ کە خۆی نەڕازێنێتەوە و تحلي خۆی نەکات بە ئەدەب، ئەمەش ڕێگای سەلەف بووە و دەبێ طالبي عیلم لێی لا نەدات و مولازەمەی بکات.

قال مخلد بن الحسين: إن الرجل ليسمع العلم اليسير، فيسود به أهل زمانه، يعرف ذلك في صدقه وورعه؛ الكفاية في علم الرواية.

مەخلدی کوڕی حسين دەیفەرموو: کەسی وا هەبوو لە سەلەف گوێبیستی عیلم و زانستێکی زۆر کەم دەبوو، بەو کەمە عیلم و زانستە دەبوو بە کەسێکی گەورە و بەڕێز لە نێو خەڵکی زەمەنەکەی خۆی، کاریگەری ئەو عیلم و زانستەی گوێی لێببوو دەبینرا لە راستگۆی و وەرعیدا.

قال سفيان: إن الرجل ليسمع الحديث الواحد، فنرى عليه ثلاثة أيام سمته وهديه.

[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

سوفیان الثوري دەفەرموویت: کەسی وا هەبوو لە پێشین گوێبیستی تەنها یەک حدیث دەبوو، دەی ئاسەواری ئەو حدیثەت لەسەر دەبینی لە ئەخلاق و خۆڕەوشتیدا بۆ ماوەی سێ دانە ڕۆژ[١].

قال الحسن: كان الرجل يطلب العلم، فلا يلبث أن يُرى ذلك في تخشُّعه، وهديه، ولسانه، ويده.

[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

الحسن بصري دەیفەرموو: کەسی وا هەبوو طلبی عیلم و زانستی دەکرد، هێندەی پێ نەدەچوو ئاسەواری ئەو عیلمەت دەبینی لە خشوع و خوڕەوشت و زمان و دەستیدا.

قال الليث بن سعد: أنتم إلى يسير الأدب أحوج منكم إلى كثير من العلم؛. شرف أصحاب الحديث

الليثي کوڕی سعد دەیفەرموو: ئێوە بۆ کەمێک لە ئەدەب زۆر پێویست ترن وەک لە زۆرێک لە عیلم[٢].

---

١ - وا تێنەگەن کە بەس بۆ سێ ڕۆژ نا بەڵکو مەبەست لەوەیە وەک ئەو کاتەی کە بیستبووی ئاوا بووە.

٢ - واتا بۆ کەمێک لە ئەدەب کە هەتان بێ ئەولا ترن وەک لەوەی حدیث و عیلمێکی زۆر بە دەست بێنن ئەو کەمە ئەدەبە پێویست ترە لە عیلمی زۆر بۆ ئێوە.

عن أبا عاصم قال: من طلب هذا الحديث فقد طلب أعلى أمور الدنيا، فيجب أن يكون خير الناس. [الجامع للخطيب]

أبا عاصم دەڵێت: هەر کەسێک طلبي حديث بکات ئەوا طلبي گەورەترين و بەرزترينی شتێکی کردووە لە دونيادا، پێويستە و واجبە لەسەری کە لە باشترينی خەڵکی بێت.

وَقَالَ يوسف بن الحسين: (بِالْأَدَبِ تَفْهَمُ الْعِلْمَ).
[اقتضاء العلم العمل للخطيب]

يوسفي کوڕی حسين دەڵێت: بە ئەدەب و ئەخلاق لە عيلم و زانست تێ دەگەی.

قال إبراهيم بن حبيب: قال لي أبي: يا بُني إيت الفقهاء والعلماء، وتعلّم منهم وخُذ من أدبهم وأخلاقهم وهديهم، فإن ذاك أحب إليَّ لك من كثير من الحديث.
[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

---

١ - ئەمەش فائدەيەکە لە فائدەکانی ئەدەب واتا ئەگەر تۆ بە ئەدەب بيت بەرامبەر بە ئەوەی واردە لە مسائلی دين بۆ نموونە کەسێک دەڵێت رسول اللّه ﷺ ئاوا دەفەرمووێت تۆ کە ئەدەبت بوو پێشی قسەی رسول اللّه ﷺ ناکەويت بەڵکو دواى دەکەوی ئەمە کە اتباعی رسول اللّه ﷺ بکەيت کەسێکی تێگەشتوويت، ئەمەش وەجهی تێگەشتنە لەم وتەيە واللّه اعلم.

ابراهيم كوڕی حبيب دەڵێت: باوكم پێی وتم ئەی كوڕەكەم بچۆ بۆ لای زانايان و فوقەهايان، فێرببە لێيان و وەری بگرە لێيان لە ئاداب و ئەخلاق و خورەوشتيان، فێربوونت لە ئاداب و ئەخلاقيان بۆ من گرنگتر و خۆشەويسترە لە زۆرێک لە حديث[1].

عن عبد اللّه بن المبارك قال: قال لي مخلد بن الحسين: نحن إلى كثير من الأدب أحوج منا إلى كثير من الحديث. الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع

عبد اللّه كوڕی مبارك دەڵێت: مخلدي كوڕی حسين پێی وتم: ئێمە زۆرێک پێويستما بە ئەخلاق و ئادابە زياتر لە پێويستيمان بۆ بە دەست هێنانی فەرمودەكانی رسول اللّه ﷺ.

وعن أبي زكريا يحيى بن محمد العنبري قال: علم بلا أدب كنار بلا حطب، وأدب بلا علم كجسم بلا روح.
[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

---

١ - حبيبي كوڕی شهيدا دەزانێت ئەدەب يارمەتيدەر نەبێ بۆ مانەوەی عيلم ئەوا عيلم دەبێتە حوجە بەسەر خاوەنەكەيەوە

ابي زكريا العنبري دەیفەرموو: عیلم و زانست بە بێ ئەدەب وەکو ئاگرێک وایە کە سوتەمەنی و داری تێدا نەمابێ، وە ئەدەبیش بەبێ عیلم و زانست وەك جسمێک وایە بەبێ ڕۆح[1].

لە کۆتای دەڵێین وە بزانە وەک شافعي دەفەرموویت: وَمَنْ لَمْ يَصُنْ نَفْسَهُ لَمْ يَنْفَعْهُ علمهُ.

[جامع بيان العلم وفضله]

هەر کەسێک خۆی نەفسی خۆی نەپارێزێ لەو شتانەی دەدات لە کەسایەتی، عیلم و زانستەکەی سودی پێ نەگەیەنێت و پاک ڕای بگرێ.

کۆکەرەوەی هەموو ئەم قسانە لە کەلامی رسول اللّه ﷺ دا کۆبووەتەوە وەک دەفەرموویت: (إِنَّ مِنْ أَخْيَرِكُمْ أَحْسَنَكُمْ خُلُقًا).

[صحيح البخاري]

---

١ - عیلم و زانست ئەدەبی لەگەڵ نەبو سودی نابێت و چواردەوری خۆی ڕوناك ناکاتەوە و نامێنێت لە کۆتایدا.

# العمل بالعلم

هەموو طلبي عیلم و زانست بۆ ئەم بابە دەکرێت وەک وتراوە: (العلم خادم العمل، والعمل غاية العلم).
عیلم و زانست خزمەتە بۆ عەمەل، وە کارو کردەوەش ئامانج و مەبەستە لە عیلم.

ئەمەش ڕێگایەکە لەو ڕێگایانەی کە سەلەف لەسەری بوون.

قال سهل بن عبد الله: العلم إحدى لذات الدنيا، فإذا عمل به صار للآخرة.

[اقتضاء العلم للخطيب]

سهلي کوڕی عبد الله دەیفەرموو: عیلم و زانست یەکێکە لە خۆشیێکانی دونیا، کاتێک کار و کردەوەی پێکرا ئەو کات بۆ ئاخیرەتە.

عن إبراهيم بن أدهم، قال: خرج رجل يطلب العلم فاستقبله حجر في الطريق فإذا فيه منقوش: اقلبني تر العجب وتعتبر، قال: فأقلب الحجر فإذا فيه مكتوب أنت بما تعلم لا تعمل، كيف تطلب ما لا تعلم؟
قال: فرجع الرجل.

[اقتضاء العلم للخطيب]

إبراهيمي کوڕی أدهم دەیفەرموو: پیاوێک دەرچوو بۆ طلب کردنی عیلم، بەردێک هاتە بەردەستی لە ڕێگای چوون بۆ طلب کردنی عیلم سەیر دەکات لەسەری نوسراوە، هەڵم بگێڕەوە شتێکی سەیر ببینە و پەند وەر بگرە لێی، دەفەرمووێ هەڵی گێڕایەوە، سەیر دەکات نوسراوە تێیدا: تۆ ئەوەی ئێستا دەیزانی کار و کردەوەی پێ ناکەی، چۆن طلبي ئەو شتانە دەکەی نایزانی؟ دەفەرمووێ: ئەم کەسە ئەوەی بینی گەڕایەوە.

قال قاسم بن اسماعيل: كنا بباب بشر بن الحارث، فخرج إلينا، فقلنا: يا أبا نصر حدثنا، فقال: أتؤدون زكاة الحديث؟ قال: قلت له يا أبا نصر، وللحديث زكاة؟ قال: نعم، إذا سمعتم الحديث، فما كان في ذلك من عمل أو صلاة أو تسبيح استعملتموه.

قاسمي کوڕی اسماعيل دەڵێت: لەلای ماڵی بشری کوڕی حارث بووین، هاتە دەرەوە بۆ لامان، وتمان: ئەی باوکی نصر حدیثمان پێ بڵێ، فەرمووی: ئایا زەکاتی حدیث دەردەکەن؟ دەڵێ منیش وتم: ئەی باوکی نصر، ئایا بۆ حدیث ـیش زەکات هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ زەکات هەیە، کاتێک کە گوێتان لە حدیث بوو، لە هەر کارێکدا بێ یاخود نوێژ بێ یاخود ذکر بێ ئەوا کار و کردووەی پێ بکەن ئەمە زەکاتی حدیثە.

قال حفص بن حميد، يقول: دخلت على داود الطائي، أسأله عن مسألة وكان كريما فقال: أرأيت المحارب إذا أراد أن يلقى الحرب، أليس يجمع آلته، فإذا أفنى عمره في الآلة فمتى يحارب، إن العلم آلة العمل، فإذا أفنى عمره في جمعه فمتى يعمل؟

[اقتضاء العلم للخطيب]

حفص بن حميد القمي دەفەرمووێ: چووم بۆ لای داودی الطائي پرسیارم لێکرد دەربارەی بابەتێک وە بەڕێز بوو لەگەڵم، پێی وتم ئایا کەسی جەنگاوەرت دیوە کە دەیەوێ بگات بە جەنگ، ئایا کەرەستە و پێداویستیەکانی جەنگ کۆناکاتەوە، دەی ئەگەر تەمەنی کۆتای پێ بێت لە کۆکردنەوەی کەرەستەکانی، کەی دەجەنگێ؟ ئەم عیلمە هۆکارێکە بۆ کار کردن، ئەگەر تەمەنت تەواو بێت لە کۆکردنەوەی زانست، کەی کردەوەی پێ دەکەی؟

عن الحسن، قال: ليس الإيمان بالتحلي ولا بالتمني ولكن ما وقر في القلوب وصدقته الأعمال، من قال حسنا وعمل غير صالح رده اللّه، على قوله، ومن قال حسنا وعمل صالحا رفعه العمل وذلك بأن اللّه تعالى يقول: ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ [الفاطر ١٠].

[اقتضاء العلم للخطيب]

الحسن بصري دەیفەرموو: ئیمان بۆ خۆ ڕازاندنەوە و تەمەنا کردن نییە، بەڵکو ئیمان بریتییە لەوەی لە ناو دڵدا جێگیر بووە و کار و کردەوەش بە ڕاستی دەخاتەوە، هەر کەسێک قسەی باش و چاک بکات، بەڵام کار و کردەوەی باش نەبێ، اللّه وەری ناگرێت و دەیگێڕێتەوە بۆ لای قسەکانی، وە هەر کەسێک قسەی باش و جوان بکات و کار و کردەوەشی چاک بێت، ئەوا کار و کردەوەکەی بەرز دەبێتەوە بۆ لای اللّه، ئەمەش لەبەر ئەوەی اللّه تعالی دەفەرمووێت ﴿إِلَيْهِ يَصْعَدُ الْكَلِمُ الطَّيِّبُ وَالْعَمَلُ الصَّالِحُ يَرْفَعُهُ﴾ [الفاطر ١٠].

عن ابن المنكدر، قال: قال محمد بن منكر: العلم يهتف بالعمل، فإن أجابه وإلا ارتحل.

[اقتضاء العلم للخطيب]

محمدی کوڕی منکدر دەفەرمووێت: عیلم و زانست پەیوەندی دەکات بە عەمەل و کار و کردەوە وە ئەگەر جوابی دایەوە دەمێنێتەوە ئەگەر جوابی نەداتەوە دەڕوات و نامێنێت.

عن صالح بن رستم، قال: قال لي أبو قلابة: إذا أحدث اللّه لك علما فأحدث له عبادة، ولا يكن إنما همك أن تحدث به الناس.

[اقتضاء العلم للخطيب]

صالح كوڕی رستم دەڵێت: ابو قلابة پێی وتم، هەر کاتێک اللّه عیلم و زانستێکی تازەی پێدای تۆش عیبادەتێکی تازەی پێ ئەنجام بدە، با هەموو هەم و خەمێکت ئەوە نەبێ بۆ خەڵکی بگێڕیتەوە.

عن عباس بن أحمد، في قوله تعالى: ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ [العنكبوت ٦٩] الآية. قال: الذين يعملون بما يعلمون نهديهم إلى ما لا يعلمون. [اقتضاء العلم للخطيب]

عباسي كوڕی أحمد له تەفسیری قەولی اللّه تعالى ﴿وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا﴾ [العنكبوت ٦٩] دەڵێت: ئەوانەی کار و کردەوە دەکەن بەوەی دەیزانن، ڕێنمونیان دەکەین بۆ لای ئەو عیلم و زانستەی کە نایزانن.

عن سهل بن عبد اللّه التستري قال: الناس كلهم سكارى إلا العلماء، والعلماء كلهم حيارى إلا من عمل بعلمه.

سەهلی کوڕی عبد اللّه دەفەرموویت: هەمو خەڵکی سەرخۆش و بێ ئاگان ئیلا زانایان نەبێت، زانایان یش هەمویان سەر لێ شێواون ئیلا ئەوانە نەبێت کار دەکەن بە عیلم و زانستەکەیان.

عن الزهري قال: لا يوثق للناس عمل عامل لا يعلم، ولا يرضى بقول عالم لا يعمل.

الزهری دەیفەرموو: خەڵکی سیقە و متمانەیان بە کار و کردەوەی کەسێک نییە کە نەزانە، وە ڕازیش نین بە قسەی کەسێکی زانا کە کار و کردەوەی نییە.

عن أبا عصمة عاصم بن عصام البيهقي قال: بت ليلة عند أحمد بن حنبل فجاء بالماء فوضعه، فلما أصبح نظر إلى الماء فإذا هو كما كان، فقال: سبحان الله رجل يطلب العلم لا يكون له ورد من الليل. [الجامع لأخلاق الراوي]

أبا عصمة دەڵێت: شەوێک لەلای امامي احمد مامەوە، جامۆڵکەیە ئاوی هێناو داینا لە لامەوە، کاتێک کە ڕۆژ بوویەوە سەیری ئاوەکەی کرد هەر وەک خۆیەتی، فەرمووی: سبحان الله پیاوێک طلبی عیلم بکات هیچ بەشێکی نەبێ لە شەودا[١].

عن أبا عمرو بن حمدان، يقول: سمعت أبي يقول: كنت في مجلس أبي عبد الله المروزي، فحضرت صلاة الظهر، فأذن أبو عبد الله، فخرجت من المسجد، فقال: يا أبا جعفر، إلى أين؟ قلت: أتطهر للصلاة، قال: كان ظني بك غير هذا، يدخل عليك وقت الصلاة وأنت على غير طهارة. [الجامع لأخلاق الراوي]

---

١ - واتا ئاوی بۆ داناوە بۆ دەست نوێژ بۆ ئەوەی شەو نوێژ بکات امام سەیری بەمە هاتوە، ئێسا دەبێ بڵێین بۆ نوێژی بەیانی خەبەری بێتەوە نەک شەو نوێژ.

أبا عمرو دەڵێت گوێم لە باوکم بو دەیوت، لە مەجلیسی ابی عبد اللّه المروزي بووم، کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات و ابو عبد اللّه بانگی دا منیش چوومە دەرەوە لە مزگەوت، پێی وتم ئەی ابا جعفر بۆ کوێ دەچی؟ منیش وتم: دەست نوێژ دەگرم بۆ نوێژ،
ابو عبد اللّه وتی: گومانی من بۆ تۆ ئاوا نەبوو، کاتی نوێژ هاتووە بەسەرتدا و تۆ دەست نوێژت نییە!

عن عمرو بن قيس الملائي، قال: إذا بلغك شيء من الخير فاعمل به ولو مرة تكن من أهله. [الجامع لأخلاق الراوي]

قەیسی مولائی دەڵێت: ئەگەر شتێکت پێ گەیشت لە خەیر، کار و کردەوەی پێبکە ئەگەر یەک جاریش بێت تا ببیت بە کەسێک لەو کەسانەی ئەو کارەیان ئەنجام داوە.

کۆتای کار کردن بە عیلم بە وتەیەکی امام احمد دێنین دەفەرموویێت: هیچ حدیثێکم لە رسول اللّه ﷺ ووە نەنوسیوە ئیللا کارم پێ کردووە هەتا جارێک بەو حدیثەی کەڵەشاخی کردووە و دینارێکی داوە بە أبا طیبە،

---

١ - طالب العلم دەبێ زۆر جیاواز بێت لە عامەی خەڵکی لە هەموو کات و ساتێکدا.

منيش دیناریکم دا کاتێک کەڵەشاخم گرت[1].

[الجامع لأخلاق الراوي]

---

١ - والله اعلم امام یەک سونەتی جێبەجێ نەکردووە ئەویش لە بەر نەتوانینی بوە ئەویش طواف کردن بە سواری تەنها ئەوەی ئەنجام نەداوە لەوەی پێی گەیشتووە.

## ينبغي على طالب العلم أن يحرص على صحبة المجتهد وأن يجتنب صحبة الكسلان والبليد

پێویسته لەسەر طالبي عیلم که پێداگر بێت لەسەر هاوڕێیەتی کردنی کەسانی مجتهید و تێکۆشەر و هەوڵدەر، دوریش بکەوێتەوە لەو کەسانەی کە تەمەڵ و بێ فەهم و خاو خلیچکن و هیچ نشاطێک یان نییە لە عیلم و عەملیاندا.

قال الزرنوجي: وأما اخْتيار الشريك، فينبغي أن يختارَ الُمجِدَّ، والوَرِعَ، وصاحبَ الطبعِ المستقيمِ والمتفهم.
ويفرّ ويحترزُ من الكسْلانِ، والمُعَطَّلِ، ومِكْثارِ الكلامِ، والمُفْسِدِ، والفتّانِ.
[كتاب من هدي السلف في طلب العلم]

الزرنوجي دەڵێت: لە هەڵبژاردنی هاوەڵ و ڕەفیق ئەوا پێویستە لەسەری کە هاوەڵێک بۆ خۆی دابنێک جدی و مجتهد بێت و تێبکۆشێ لە طلبی عیلمدا، وە خاوەنی وەرع بێت، وە خاوەنی طبع و ئەخلاقێکی ڕاست و جوان بێت وە کەسێکی تێگەشتوو بێت خاوەن فەهم بێت، وە پێویستە ڕابکەن و دووربکەونەوە لە هاوەڵێتی کەسانی تەمەڵ و کەسانێک کە ژیانیان پەک خواردوە، وە قسە زۆرکەرن، وە موفسید و تێکچون و توش بون بە فتنە و توشت دەکەن.

قال الشاعر:

لا تصحبِ الكسلان في حاجاتهِ
كم صالح بفساد آخر يفسدُ
عدوى البليد إلى الجليد سريعةٌ
والجمر يوضع في الرماد فيخمدُ

قيل لسفيان: من نجالس؟ قال: من تذكركم باللّه رؤيته، ويرغبكم في الآخرة عمله، ويزيد في علمكم منطقه.

[حلية الأولياء]

پرسيار كرا له سوفيان الثوري لهگهڵ كێ دابنیشێن؟ فهرمووی: لهگهڵ كهسانێكدا دهبنیشن كه تهنها بینین یان اللّه ـتان وه بیر بێنێتهوه، ههر كاتێك كار و كردهوهی دهبینن ڕهغبهتتان پێ بدات بۆ بهدهست هێنانی قیامهت، وه قسه كردنیشی ببێت به هۆی زیاد بوونی عیلم و زانستـتان[1].

قَالَ قَتَادَةُ: إِنَّا وَاللّهِّ مَا رَأَيْنَا الرَّجُلَ يُصَاحِبُ مِنَ النَّاسِ إِلا مِثْلَهُ، وَشِكْلَهُ،

---

١ - كهسانێكتان دهست كهوت بهم شێوه بن تێكهڵ بن لهگهڵیان وه ئیللا واز له تێكهڵی كهسلان و دونیا ویستان بێنن.

فصاحبوا الصَّالِحِينَ مِنْ عِبَادِ اللّهِّ لَعَلَّكُمْ أَنْ تَكُونُوا مَعَهُمْ، أَوْ مِثْلَهُمْ. [الإبانة الكبرى]

قتادة دەڵێت: سوێند بە اللّه نەمان دیوە کەسێک هاوڕێیەتی کەسێک بکات ئیللا هاوشێوە و هاو وێنەیەتی،. دەی هاوڕێیەتی بۆ خوا سوڵحاوان بکەن لە بەندەکانی اللّه، بە ڕەجای ئەوەی لە قیامەت لەگەڵ ئەودا بن و هاوشێوەی ئەوبن.

قال مالك بن دينار: الناس أجناس كأجناس الطير؛ الحمام مع الحمام، والغراب مع الغراب، والبط مع البط، والصعو مع الصعو، وكل إنسان مع شكله. [الابانة الكبرى]

مالیکی کوڕی دینار دەفەرموویت: خەڵکی جۆراو جۆرن وەک جۆر و جنسی باڵندەکان، کۆتر لەگەڵ کۆتردایە، قەلەڕەش لەگەڵ قەلە ڕەشدایە، مراوی لەگەڵ مراویدایە، چۆلەکە لەگەڵ چۆلەکەدایە، وە هەموو کەسێک لە مرۆڤەکان لەگەڵ هاوشێوەی خۆیاندان[١].

١ - یا طالب عیلم جدی بە لە گرتنی ڕەفیق تەنانەت لە نێو موسڵمانان یش جیایان بکەوە کامیام زیاتر ڕەغبەتت پێ دەدەن بۆ زانست و عیلم لەگەڵ ئەویان بە دەنا قسەکەی مالک بێتە جێ تۆ طالبي عیلم نیت لە بەر ئەوەی پێی وتین هەمو خەڵکی لەگەڵ ئەو کەسانەن کە وەک خۆیانن.

قال امام الشافعي: ينبغي للرَّجل أن يتوخى لِصُحْبَتِهِ أهل الوفاء والصّدق، كما يتوخى لوديعته أهل الثقة والأمانة.

[كتاب الإنتقاء]

امامی شافعي ئەیفەرموو: پێویستە لەسەر مرۆڤ كەسی بەوەفا و ڕاستگۆ هەڵبژێریت بۆ هاوەڵێتی و هاوڕێیەتی كردن، وەک چۆن بۆ جێهێشتنی كەس و ئەهلەكەی كەسانی متمانە پێكراو ئەمین هەڵدەبژێرێت.

مجاهد دەیفەرموو: براو هاوەڵەكانم هەڵدەبژێرم و جیایان دەكەمەوە هەر وەک چۆن خورمای جوان تەڕ جیا دەكەمەوە.

[النوادر والنتف]

عن سفيان لثوري قال،: ما وجدنا شيئًا أنفع في دين ولا دنيا من أخ موافق.

[حلية الأولياء]

سوفیانی الثوری دەیفەرموو: هیچ شتێكمان دەست نەكەوتووە بە سود تر بێ بۆ دین هەم بۆ دونیاش، لە برایەک كە موافەقەی هەبێت و وەک خۆت بێ.

## أخذ العلم عن أهله، اذا لم يكن مستند علمك هكذا خسرت

وەرگرتنی عیلم و زانست لە ئەهلی خۆی ئەمە تەنها بۆ طالبي عیلم نییە بەڵکو بۆ عامەی خەڵکیە و دەبێ بزانین دین و بیرو باوەڕمان لە کێ وەردەگرین،

وەک امامی بەڕێز ابن بطه دەفەرموویێت: فإنه لا ينصح الناس من غش نفسه، ومن لا خير فيه لنفسه لا خير فيه لغيره.

ئەو کەسەی غەش و خیانەتی لە نەفسی خۆی کردووە ناتوانێ ببێ بە ئامۆژگاری کار بۆ خەڵکی، ئەو کەسەی خێری تێدا نەبێ بۆ نەفسی خۆی ئەوا خێری تێدا نییە بۆ غەیری خۆی[1].

کەواتە دەڵێین: (اذا لم يكن مستند علمك هكذا خسرت): ئەگەر پاڵپشتی عیلم و زانست لای تۆ ئا بەم شێوازە نەبێ کە باس دەکرێت ئەوا کەسێکی خەسارەت مەندی و دینت سەلامەت نییە.

قال أبو حمزة السكري: يُجاء بي يوم القيامة، فيقال من حدَّثك؟ فأقول الأعمش.

فيقال للأعمش؛ فيقول: إبراهيم.

فيقال لإبراهيم؛ فيقول: علقمة.

---

١ - بۆیە دەبێ ئاگادار بین کەسێک خۆی دینی لا نەبێ ناتوانێ دین و عقیدەی ڕاست و صحیح بدات بە تۆ.

فيقال لعلقمة: من حدَّثك؟ فيقول عبد اللّه بن مسعود رضِـي اللّه عنه؛ حتى ينتهي إلى النبي ﷺ، وإلى جبريل وإلى الرب عزَّ وجلَّ.

[ذمُّ الكلام]

ابو حمزەی السكري دەڵێت: لە ڕۆژی قیامتدا من دەهێنن، پێم دەڵێن عیلم و زانستت لە كێوە وەرگرتووە؟

دەڵێم لە أعمش ـوە وەرم گرتووە، لەو كاتە من نەجاتم دەبێت و دەڕۆم،

دەچن بۆ لای أعمش و پێی دەڵێن، عیلم و زانستت لە كێوە وەرگرتووە؟

أعمش دەڵێت: لە ئیبراهیم ـەوە وەرم گرتووە، بە ئیبراهیم دەڵێن لە كێوە وەرت گرتووە، دەڵێت: علقمە، بە علقمە دەوترێت كێ ئەو عیلمەی داوە بە تۆ دەڵێت: عبد اللّه ی كوڕی مەسعود رضي اللّه عنه هەتا دەگاتەوە بە رسول اللّه ﷺ، دواتر بۆ جبريل و جبريل ـیش لە اللّه جل جلالە عیلم و زانستەكەی وەر گرتووە[١].

---

١ - دەی ئەگەر وەرگرتنی دینەكەت ئا بەم شێوە نەبێت خەسارەت مەندی، لە قیامەت پرسیارت لێ دەكرێ ئا بەو شێوە نەبی ناتوانی جواب بدەیتەوە ناكرێ پرسیارت لێ بكەن لە كێت وەر گرتووە بڵێی ماموٚسا فلان و علان بۆیە ئاگادار بەو بە ئاگا بە دینەكەت لە كێ وەر دەگریت.

قال حماد بن زيد: دخلنا على أنس بن سيرين في مرضه؛ فقال: اتقوا اللّه يا معشر الشباب؛ انظروا ممن تأخذون هذه الأحاديث؛ فإنها من دينكم. [الجامع للخطيب]

حمادي كوڕی زيد دەڵێت: چوين بۆ لای أنس كوڕی سيرين لە نەخۆشيێكەيدا پێی وتی: ئەی گەنجەكان لە خوا بترسن، سەير بكەن بزانن ئەم حديثانە لە كێوە وەردەگرن، چونكە بەڕاستی لە دينەكەتانە.

قال خالد بن خِدَاش البصري: ودّعت مالك بنَ أنس، فقلتُ: يا أبا عبد اللّه أوصني. قال: تقوى اللّه، وطلب العلم من عند أهله.

[ذمّ الكلام للهروي]

خاليدی كوڕی خداش دەڵێت: امامي مالك ـم جێهێشت و پێم وت: ئەی باوكی عبد اللّه نصيحەتت بۆ من چييە؟ فەرمووی: تەقوای اللّه ـت هەبێت، وە طلبي عيلم بكە لەلای ئەوانەی ئەهلی ئەوەن طلبي عيلميان لەلا بكرێت.

قال الإمام الأوزاعي رحمه اللّه: اتقوا اللّه معشر المسلمين، واقبلوا نصح الناصحين، وعظة الواعظين، واعلموا أن هذا العلم دين فانظروا ما تصنعون وعمن تأخذون وبمن تقتدون ومن على دينكم تأمنون؛ فإن أهل البدع كلهم مبطلون. [تاريخ دمشق]

امامي الأوزاعي دەیفەرموو: لە اللّە بترسن ئەی موسڵمانان، نصیحەتی نصیحەت کاران وەر بگرن و ئامۆژگاری ئامۆژگاری کاران وەر بگرن، وە بزانن ئەی موسوڵمانان ئا ئەم عیلم و زانستە دینە سەیر بکەن بزانن چی دەکەن و لە کێ دینەکەتان وەر دەگرن، بە کێ اقتدا دەکەن و چاو لە کێ دەکەن وە کێ دەکەن بە ئەمین لەسەر دینەکەتان لەبەر ئەوەی بەڕاستی ئەهلی بیدەع و ڕەئی هەمویان لەسەر بەتاڵن.

قال حماد بن سلمة: حدثني شيخ لهم -يعني الرافضة- تاب، قال: كنَّا إذا اجتمعنا واستحسنا شيئًا جعلناه حديثًا.

[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

حمادی کوڕی سلمة دەڵێت: کەسێک لە رافضەکان کە تەوبەی کردبو پێی وتم: ئێمە هەر کاتێک کۆببوی نایەتەوە شتێکمان چاک دەکرد لە قسە و کەلام و دەمان کرد بە حدیث[١].

عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: كَانُوا إِذَا أَتَوُا الرَّجُلَ يَأْخُذُونَ عَنْهُ الْعِلْمَ، نَظَرُوا إِلَى صَلَاتِهِ وَإِلَى سَمْتِهِ وَإِلَى هَيْئَتِهِ، ثُمَّ يَأْخُذُونَ عَنْهُ.

[سنن الدارمي]

---

١ - حقیقەتی ئەهلی بیدەع ئا بەم شێوەیە.

إبراهيم دەڵێت: سەلەف ئەگەر بچوبان بۆ لای کەسێک بۆ ئەوەی عیلم و زانستی لێوەر بگرن، ئەوا سەیری نوێژکردنی و حاڵ و هەیئەتی ئەو کەسەیان دەکرد و دواتر عیلم و زانست یان وەردەگرت لێی.

عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ قَالَ: كُنَّا نَأْتِي الرَّجُلَ لِنَأْخُذَ عَنْهُ، فَنَنْظُرُ إِذَا صَلَّى، فَإِنْ أَحْسَنَهَا جَلَسْنَا إِلَيْهِ وَقُلْنَا: هُوَ لِغَيْرِهَا أَحْسَنُ، وَإِنْ أَسَاءَهَا قُمْنَا عَنْهُ وَقُلْنَا: هُوَ لِغَيْرِهَا أَسْوَأُ.

[سنن الدارمي]

أبي العالية دەڵێت: ئێمە دەچوین بۆ لای کەسێک بۆ ئەوەی زانستی لێوەر بگرین، سەیرمان دەکرد کاتێک نوێژی دەکرد ئەگەر نوێژەکەی بە ڕێک و پێکی و جوانی کردبا دادەنیشتین بۆ ئەوەی زانستی لێ وەر بگرین و دەمان وت تەواو: بۆ غەیری نوێژەکەی چاکتریشە، وە ئەگەر نوێژەکەی خراپ بکردبا و ڕێکو پێک نەبوا ئەوا هەڵدەستاین لەلای و دەڕۆشتین دەمان وت ئەمە بۆ غەیری نوێژەکەی لەمە خراپترە و زانستمان لێوەر نەدەگرت.

عَنْ طَاوُسٍ قَالَ: جَاءَ بُشَيْرُ بْنُ كَعْبٍ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَجَعَلَ يُحَدِّثُهُ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أَعِدْ عَلَيَّ الْحَدِيثَ الْأَوَّلَ. قَالَ لَهُ بُشَيْرٌ: مَا أَدْرِي عَرَفْتَ حَدِيثِي كُلَّهُ وَأَنْكَرْتَ هَذَا -أَوْ: عَرَفْتَ هَذَا وَأَنْكَرْتَ حَدِيثِي كُلَّهُ- فَقَالَ

ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّا كُنَّا نُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ إِذْ لَمْ يَكُنْ يُكْذَبُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا رَكِبَ النَّاسُ الصَّعْبَةَ وَالذَّلُولَ تَرَكْنَا الْحَدِيثَ عَنْهُ.

[سنن الدارمي]

طاوس دەفەرموویت: بشیری کوڕی کعب هات بۆ لای ابن عباس، دەستی کرد بە حدیث گێڕانەوە، ابن عباس رضي اللّه عنهما فەرمووی: حدیثی یەکەم دووبارە بکەرەوە، بشیر پێی وت: نازانم هەموو حدیثەکان باش بوون لەلات جگە لەمە یاخود ئەمەت بە پەسەند زانی و ئەوانی ترت لا پەسەند نەوبو، ابن عباس فەرمووی ئێمە حدیث مان دەگێڕایەوە لە رسول اللّه ﷺ لەو کاتەی درۆی بە دەمەوە نەدەکرا، بەڵام کاتێ خەڵکی هەموو ڕێگا لار و چەوتەکان یان گرتە بەر بە سواری، وازمان هێنا لە گێڕانەوەی فەرموودە.

## قلة العلم وقبض العلماء، ومثل العالم

سەبەب و هۆکارێک لەو هۆکارانەی خەڵکی بە هەلاک چوون و تووشی حیرة بوون و سەریان لێ تێکچووە نەمانی زانایانە و خەڵکانێک کراون بە پێشەنگ لە دیندا لە ناو خەڵکی کە ئەو کەسە خۆیشی نازانێ دینەکەی بۆ لای کێ مستندە و پاڵدراوە.

بۆیە دەڵێین ئەو ئاو چاوگەی ئاوی تێدا نییە تۆ ناتوانی ئاوی لێ دەر بکەی ئەو کەسەی دینی نییە ناتوانێ دین بدات بە تۆ.

قال ميمون بن مِهران رحمه اللّه: مثل العالِم في البلد مَثل العين تروي وتكفي، يتَّكل عليها أُناسٌ، فبينا هم كذلك إذ غارت العينُ، فاحتاج الذين اتَّكلوا إلى الذين نزفوا، وكذلك العالِم.
[رواه عيسى بن سالم الشاشي في جزئه، جامع بيان العلم وفضله]

ميموني کوڕی ميهران دەيفەرموو: نمونەی کەسی عالم و زانا لە شارێکدا وەک نمونەی ئەو چاوگەيە بە دايمی ئاو دەنێرێت بە ناو شارەکە و خەڵکی شارەکە پێداويستی خۆيانی پێ بە جێ دەگەيەنن و خەڵکانێکی زۆر پشت بەو چاوگە دەبەستن، لەو کاتەی خەڵکی پشتيان بەو سەرچاوەی ئاوە بەستووە و ئاوی لێوور دەگرن کاتێک دەزانن ئاوی ئەو چاوگە نامێنێ و وشک دەکات، ئەوانەی پشتيان

بەو چاوگە بەستبوو ئیحتیاطي خۆیان نەخستبوو ئاویان هەڵنەگرتبوو لە ماڵیاندا ئیحتاجیان دەکەویّتە لای ئەوانەی کە ئاویان لە ماڵی خۆیان غەزن کردووە و هەڵگرتووە دەی نموونەی کەسی عالم و زانا وەک ئەو چاوگی ئاوەیە.

قال عمر بن عبدالعزيز: النار لا ينقصها ما أخذ منها، ولكن ينقصها ألا تجد حطبا، وكذلك العلم لا ينقصه الاقتباس منه، ولكن فقد الحاملين سبب عدمه. [جامع بيان العلم وفضله]

عمر بن عبدالعزيز رحمه اللّه دەفەرموویّت: ئاگر کەم نابێتەوە بەوە لێی وەردەگیرێ بەڵکو کەم دەبێتەوە بەوەی کە کە سوتەمەنی تێدا نەمێنێ، وە هەروەها زانست کەم ناکات بە وەرگرتن لێی و لێ دەرکردنی، بەڵکو دیار نەمان و ونکردنی هەڵگرانی ئەو زانسە هۆکاری نەمانێتی.

وقال الزهري: إن للعلم غوائل، فمن غوائله أن يُترك العالم حتى يذهب بعلمه. [جامع بيان العلم]

الزهري دەفەرموویّت: بەڕاستی بۆ عیلم و زانست تیاچوون هەیە، لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی نەمانی زانست ئەوەیە واز لە زانایان بهێنرێت تاوەکو ئەوکاتەی وەفات دەکەن و بە عیلم و زانستە کەیانەوە دەڕۆن.

# أول العلم القرأن

گەورەترین مەرتەبە لە طلبي عیلمدا بریتییە لە طلبي قورئان بە لەبەر کردنی و بە فەهمی، بۆیە دەبێت فێرخواز گرنگی پێبدات لە پێش هەموو عیلم و زانستەکانی دیکە.

قال ابن مسلم: كنا إذا جالسنا الأوزاعي فرأى فيناً حدثاً، قال: يا غلام، قرأت القرآن؟ فإن قال: نعم، قال: اقرأ ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ﴾ [النساء ١١] وإن قال: لا، قال: اذهب تعلم القرآن قبل أن تطلب العلم.

[الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع]

ابن موسلم دەڵێت: ئێمە هەر کاتێک دابنیشتبایین لە لای الأوزاعی کەسێکی تازە پێگەشتووی ببینیبا تێماندا دەیوت: ئەی غلام، قورئانت خوێندوە و لەبەرتە؟ ئەگەر بیوتبا بەڵێ: ئیختیباری دەکرد و دەیوت بخوێنە ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ﴾ [النساء ١١]

وە ئەگەر بیوتبا نەخێر: دەی وت بڕۆ فێری قورئان ببەو لەبەری بکە پێش ئەوەی طلبي سائری عیلمەکان بکەیت.

خطیب دەڵێت: پێویستە فێرخواز دەست پێ بکات بە حفظ کردنی کتابی اللّه جل جلاله.

ابن عبد البر دەڵێت: سەرەتای عیلم و زانست حفظ و فەهمی قورئانە دواتر عیلمەکانی دیکە.

السفاريني لە کتێبی غذاء الألباب ومفادە هێناویێتی جیاوازی لە نێوان منداڵ و گەورە بۆ حفظی قورئان.

قسەی ئیمامی أحمد دەهێنێت لە مەیموني دەڵێت پرسیارم کرد لە امامی ڵحمد، کامیانت لە لا خۆشەویسترە منداڵەکەم دەست پێ بکات بە حدیث یاخود قورئان، امامی احمد فەرمووی: نەخێر، با بە قورئان دەست پێ بکات، دەڵێت وتم هەموو قورئانی فێر بکەم؟ وتی ئیللا ئەوەی نەبێ قورسە فێربوونی، پاشان فەرمووی: ئەگەر جارێک خوێندیەوە دووبارەی بکەرەوە پێی، بەڵام بۆ کەسی گەورە لە پێشترە فێری عیلم و زانستەکانی تر ببێت.
السفاريني قسەی ابن مبارك دێنێت کە پیاوێک پرسیاری لێدەکات زیادەی ڕۆژەکەی خەریکی چیبێ فێربوونی قورئان یان عیلمەکانی دیکە، پێی دەڵێت ئەوەندە قورئان دەزانی ئیقامەی نوێژەکەتی پێ بکەی؟ دەڵێ بەڵێ، ابن مبارك دەفەرموویێت: دەی خەریکی عیلم بە طالبي عیلم دەبێت بزانێت جیاوازە لە عامەی خەڵکی، هەوڵ بدات قورئان ظبت بکات و فەهمی بکات و چۆنێتی دەلیل هێنانەوە فێر ببێت چۆن بەڵگە بهێنێتەوە و استنباط بکات لە دەقەکان،

لا للّه تعالى دەفەرمووێت: ﴿بَلْ هُوَ آيَاتٌ بَيِّنَاتٌ فِي صُدُورِ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ﴾ [العكبوت ﴿٤٩﴾] قورئان لە سنگی ئەو کەسانەدایە کە خاوەن عیلمن بەراستی.

## نعم الشفيع القرآن

عَنْ شُعْبَةَ، عَنْ عَاصِمٍ، عَنْ ذَكْوَانَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، أَنَّهُ قَالَ: «نِعْمَ الشَّفِيعُ الْقُرْآنُ.

[فَضَائِلُ الْقرآن للقاسم بن سلام]

ذكوان دەڵێت ابو هريرة رضي اللّه عنه دەيفەرموو: قورئان باشترين شەفاعەت كارە لە ڕۆژى قيامەتدا بۆ هاوەڵەكەى.

عن ابو هريرة قَالَ: يَقُولُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ: يَا رَبِّ حَلِّهِ، فَيَلْبِسُ تَاجَ الْكَرَامَةِ، ثُمَّ يَقُولُ: يَا رَبِّ زِدْهُ، فَيُكْسَى حُلَّةَ الْكَرَامَةِ، فَيَقُولُ: يَا رَبِّ ارْضَ عَنْهُ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَعْدَ رِضَاكَ شَيْءٌ. قَالَ: فَيَرْضَى عَنْهُ. فَضَائِلُ

[الْقرآن للقاسم بن سلام]

ابو هريرة رضي اللّه عنه دەفەرموويێت: ثواب و پاداشتى قورئان لە ڕۆژى قيامەتدا دەڵێت: ئەى پەروەردگار بيڕازێنەوە و ڕێزى لێبنىَ، تاجى ڕێز و شكۆ دەكرێتە سەرى،

دەڵێت يا رب زياتر: پۆشاكى ڕێز و شكۆ و كەرامەت دەكرێتە بەرى،.

دەڵێت: يا رب لێى ڕازى ببە، هيچ شێك نامێنێت لە دواى ڕازى بوونى تۆ: اللّه جل جلاله لێى ڕازى دەبێت.

قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: إِنَّمَا هَذَا ثَوَابُهُ، فَأَمَّا الْقُرْآنُ فَهُوَ كَلَامُ اللّهِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى.

أبو عبيد دەڵێت: ئەمە ثواب و پاداشتی قورئانە ئەما قورئان كەلامی اللّه یە.

[فَضَائل الُقرآن للقاسم بن سلام]

## من صاحب القرآن

قال الإمام الآجُرِّي رحمه الله تعالى: أَلا تَرَوْنَ رَحِمَكُمْ اللهُ إِلَى مَوْلاكُم الْكَرِيْم كَيْفَ يَحُثُّ خَلْقَهَ عَلَى أَنْ يَتَدَبَّرُوا كَلامَهُ، وَمَنْ تَدَبَّرَ كَلامَهُ عَرَفَ الرَّبَّ، وَعَرَفَ عَظِيمَ سُلْطَانِهِ وَقُدْرَتِهِ، وَعَرَفَ عَظِيمَ تَفَضُّلِهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ، وَعَرَفَ مَا عَلَيْهِ مِنْ فَرْضِ عِبَادَتِهِ، فَأَلْزَمَ نَفْسَهُ الْوَاجِبَ، فَحَذِرَ مِمَّا حَذَّرَهُ مَوْلاهُ الْكَرِيْمُ، وَرَغِبَ فِيمَا رَغَّبَهُ فيه.

وَمَنْ كَانَتْ هَذِهِ صِفَتُهُ عِنْدَ تِلاوَتِهِ لِلْقُرْآنِ، وَعِنْدَ اسْتِمَاعِهِ مِنْ غَيْرِهِ، كَانَ الْقُرْآنُ لَهُ شِفَاءً، فَاسْتَغْنَى بِلا مَالٍ، وَعَزَّ بِلا عَشِيرَةٍ، وأَنِسَ بِمَا يَسْتَوحِشُ مِنْهُ غَيْرُهُ، وَكَانَ هَمُّهُ عِنْدَ تِلاوَةِ السُّورَةِ إِذَا افْتَتَحَهَا: مَتى أَتعِظُ بِمَا أَتْلُو؟ وَلَمْ يَكُنْ مُرَادُهُ: مَتى أَخْتِمُ السُّورَةَ؟ وَإِنَّمَا مُرَادُهُ: مَتى أَعْقِلُ عَنْ اللهِ الْخِطَابَ؟ مَتى أَزْدَجِرُ؟ مَتى أَعْتَبِرُ؟ لأَنَّ تِلاوَتَهُ لِلْقُرْآنِ عبادة، والعبادة لا تَكُونُ بِغَفْلَةٍ، وَاللهِ الْمُوَفِّقُ لذلك.

[أخلاق حملة القرآن]

امامی الآجري دەفەرموویێت: نابینن ڕەحمەتی خوای پەروەردگارتان لێبێت چۆن اللّه جل جلاله هانی خەڵکی دەدات بۆ ئەوەی بیربکەنەوە و تدبریان هەبێت لە کەلامی موبارەکی خۆی، هەر کەسێک تدبری کەلامی اللّه بکات و هەوڵ بدات لە واتاکانی تێبگات ئەوا پەروردگاری دەناسێت، وە گەورەی و دەسەڵات و قودرەت و توانای اللّه جل جلاله

دەناسێت، وە گەورەی و زۆری نیعمەت و فەزڵی اللّه دەزانێت بەسەر ئیمانداران ـەوە،

وە هەر کەسێک تدبری کەلامی اللّه بکات ئەوا دەزانێت کامەیە ئەو واجبانەی دراوە بە سەریدا و ئەوا نەفسی خۆی مولزەم دەکات بەو حەق و مافانەی اللّه جل جلالە داوای لێدەکات، وە بە حەزەر و ئاگادار دەبێ لەو شتانەی اللّه جل جلالە حەزەری بەندەکانی پێداوە، وە ئەوەی اللّه هانی بەندەی داوە لەسەری ئەنجامی بدەن ئەمیش هەوڵی بۆ دەدات و هانی نەفسی لەسەر دەدات.

هەر کەسێک ئا ئەمە صیفەتی بێت و ئا بەم شێوە بێ باس کرا لە کاتی خوێندنەوەی قورئان، یاخود لە کاتی گوێبیست بوونی قورئاندا لە غەیری خۆی، ئەوا قورئان بۆی دەبێت بە شیفا، وە ئەو کەسە کەسێکی دەوڵەمەندە بە بێ ماڵ و سامان، وە کەسێکی سەر بەرز و بە عیزەتە بەبێ عەشرەت و بنەماڵە، ئەم کەسە لەو کاتەی خەڵکی لەسەرگەردانی و بێتاقەتی دان ئەم قورئان دڵنەوای دەرێتی و لەگەڵیدایە، وە کەسێک بەم شێوە بێت کاتێک قورئان دەخوێنێت هەم و خەمی ئەوەیە کەی پەند و ئامۆژگاری وەر بگرێت لەوەی دەیخوێنێت؟ ئەم کەسە مەبەست و نیەتی ئەوە نییە کەی تەواو بێ لەم سورەتە؟ ئەو کەسەی ئەهلی قورئانە مەبەستی ئەوەیە کەی تێبگات لە خطابی اللّه جل جلالە داواکاری و نەهی اللّه چیە بۆی؟ کەی بگەڕێمەوە لە سەرپێچی؟ کەی پەند و ئامۆژگاری وەر بگرم؟ لەبەر

ئەوەی خوێندنەوەی قورئان عبادەتە، دەی عیبادەتیش بە بێ ئاگای و غەفڵەت نابێ، اللّه جل جلاله ڕێنموکاری بەندەکانێتی.

## فضل أهل الحديث

أَصْحَاب الْحَدِيثِ هُمْ حَمَلَة هَذَا الْعِلْمِ وَأُمَنَاءُ اللّهِ عَلَى دِينِهِ وَحُفَّاظُ سُنَّةِ نَبِيِّهِ ﷺ.

ئەهلی حدیثن هەڵگرانی ئەم زانست و عیلمەن وە ئەو کەسانەن اللّه کردونی بە ئەمین و پارێزەر بۆ دینەکەی وە پارێزگاری کار لە سوننەتی رەسولەکەی ﷺ.

هەر ئەهلی حدیثن کە ئیسلامیان بە پاکی بێ خەوشی ڕاگرتووە لولاهم لم تجد عند الناس شيئا من السنن.

قال علي بن المديني في حديث النبي ﷺ: (لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق لا يضرهم من خالفهم) هم أهل الحديث والذين يتعاهدون مذاهب الرسول ويذبون عن العلم، لولاهم لم تجد عند المعتزلة والرافضة والجهمية شيئا من السنن.

[الرحلة في طلب الحديث]

علي کوڕی المديني دەڵێت: ئەوانە ئەهلی حدیثن ئەوانە ئەو کەسانەن کە بەردەوام خەریکن و مودارەسەی حدیث و مذاهیبی رسول اللّه ﷺ دەکەن، دیفاع لە عیلم و زانست دەکەن و بە پاکی ڕای دەگرن لە نێو خەڵکیدا، ئەگەر ئەهلی حدیث نەبن ئەوا نە لەلای

معتزیلەکان نە رافضەکان نە جەهمیەکان هیچ شتێک لە سوننەتەکانی رسول اللّه ﷺ بە دی نەدەکرا[1].

عن سُفْيَانَ الثَّوْرِيَّ قال: سَمَاعُ الْحَدِيثِ عِزٌّ لِمَنْ أَرَادَ بِهِ الدُّنْيَا، وَرَشَادٌ لِمَنْ أَرَادَ بِهِ الْآخِرَةَ.

[شَرَف أصحَاب الحَدِيث]

سوفیانی الثوری دەیفەرموو: سەماعی حدیث و گوێ بیست بوون لە حدیث سەربەرزی و شکۆیە بۆ خاوەنەکەی لە دونیادا بۆ ئەو کەسانەی نیەتیان بۆ دونیایە، وە ڕێنمونی کارە بۆ ئەو کەسانەی هەوڵ و ویستیان بۆ ئاخیرەتە.

عن ابا بكر الهذلي قال، قال لي الزهري ايعجبك الحديث؟ قلت نعم قال: اما انه يعجب ذكور الرجال، ويكرهه مؤنثهم اما ذكور الرجال، فهم الذين يطلبون الحديث والعلم وعرفوا قدره، واما مؤنثهم فهم هؤلاء الذين يقولون ايش نعمل بالحديث وندع القران، او ما علموا ان السنة تقضي على الكتاب.

[الجامع لأخلاق الراوي]

---

١ - لەبەر ئەوەی هەموو ئەو فیرقە گومڕایانە مرجع لایان ڕەئیە نەک سوننەتی رسول اللّه ﷺ.

ابا بكر الهذلي دەڵێت: زوهری پێی وتم سەرسامی بە حدیث و لات پەسەندە؟
وتم بەڵێ، فەرمووی: بەڵێ طلبي حدیث لەلای ئەوانەی پیاون پەسەند و خۆشەویستە، ئەما ئەوانەی پیاوی تەواو نین و وەک ئافرەتن طلبی حدیث یان لا پەسەند کراو نییە، دواتر فەرمووی: پیاوی تەواو ئەوانەن کە طلبي حدیث دەکەن و وە قەدریشی دەزانن، وە ئەوانەی وەک ئافرەتن بریتیین لەو کەسانەی دەڵێن: چی بکەین لە حدیث واز لە قورئان بێنیین؟ فەرمووی: ئەوانە نازانن کە سوننەت قاضیە بەسەر قورئانەوە.

لە گەورەی و پێگەی ئەهلی حدیثە،
رسول اللّه ﷺ دوعای بۆ کردووە: (نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ) اللّه ڕووی ئەو کەسانە گەش و جوان بکات حدیثێک لە حدیثەکانم دەبیستێت وەک خۆی وەری دەگرێت و دەیگەیەنێت بە خەڵکی.

قال سفيانُ بنُ عيينةَ رحمهُ اللّهِ: ما مِن أحدٍ يطلبُ الحديثَ إلَّا وفي وجهِهِ نضرةٌ، لقولِ النبيِّ ﷺ: (نضَّرَ اللّهِ امرأً سَمِع منَّا حديثًا فبلَّغَه).
[شرفُ أصحاب الحديث]

سوفیانی کوڕی عیینة دەیفەرموو: هیچ کەسێک نیە طلبي حدیث بکات ئیلا ڕوی گەشەو ناوچاوی نورانیە لە بەر دوعاکەی رسول اللّه ﷺ کە فەرمووی: (نضَّرَ اللّهُ امرَأً سَمع منَّا حديثًا فبلَّغَه).

قَالَ نَصْرُ بنُ زَكَرِيَّا: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بنَ يَحْيَى الذُّهْلِيَّ: سَمِعْتُ يَحْيَى بنَ مَعِيْنٍ يَقُوْلُ: الذَّبُّ عَنِ السُّنَّةِ، أَفْضَلُ مِنَ الجِهَادِ فِي سَبِيْلِ اللّهِ.
فَقُلْتُ لِيَحْيَى: الرَّجُلُ يُنْفِقُ مَالَهُ، وَيُتْعِبُ نَفْسَهُ، وَيُجَاهِدُ، فَهَذَا أَفْضَلُ مِنْهُ؟! قَالَ: نَعَمْ، بِكَثِيْرٍ.

[ذم الكلام للهروي]

محمدی کوڕی یەحیا الذهلي دەیفەرموو: گوێم لە یەحیای کوڕی معین بو دەیوت: پارێزگاری کردن لە سوننەت، چاکتر و باشترە لە جیهاد کردن لە پێناو اللّه دا.
وتم بە یەحیا: پیاوێک ماڵەکەی دەبەخشێت و نەفسی خۆی ماندو دەکات و جیهاد دەکات، لەمەش گەورەترە؟ فەرمووی بەڵێ: بە زۆر دەرەجە لەو گەورەترە[١].

---

١ - ئەو خطرەی لەسەر طالبي عیلمە کەمتر نیە لە کەسی موجاهید هەردوکیان لەو کەسانەن ئەگەر نیەتیان راست نەبێ لەو کەسانەن دۆزەخیان پێ خۆش دەکرێ موجاهید دیفاع دەکات طالبی عیلم یش بە بەردەوام دین دەپارێزێت و جیهاد دەکاو تێدەکۆشێت بەرامبەر ئەهلی بیدەع و کافر و موشریکان کەسی موجاهید ئەگەرێکی هەیە بدرێ =

قال سفيان الثوري رحمه الله: الملائكة حُراسُ السماء، وأصحابُ الحديث حُراس الأرض. [شرف أصحاب الحديث]

سوفیانی الثوري دەیفەرموو: مەلائکەکان حەرەسی ئاسمانەکانن وە أصحابي حديث حەرەسی سەر زەوین.

قال أبو عروبة الحراني: الفقيه إذا لم يكن صاحب حديث، يكون أعرجَ؛ [شرف أصحاب الحديث].

أبو عروبة دەیوت: کەسی فەقیهـ ئەگەر هاوڵ و خاوەنی حدیث نەبێت، ئەوا شەل دەردەچێ[1].

سوفیانی کوڕی عیینه دەفەرموویت: سوفیانی ثەوری، هەڵگران و ئەهلی فەرموودەی ناو نابوو (الجُّلاب) واتە ئاوی گوڵ.
[ذم الكلام الهروي]

عبدالرحمن بن حمدان دەڵێت: أبو علي کوڕی خالویه لەگەڵم بوو لە طەرەسوس ڕەفیقم بوو، لەگەڵم بو لەو ماڵەی منی تیا بووم،

---

= لە ملی و شەهید بکرێ طالبی عیلم دەبێت زیاتر مقاوەمە بکات و ئاگای لە نیەت و کارەکەی بێ بە بەردەوامی.

١ - حدیث هەمو دەقەو ساتێ بەڵگە و دەلیلە دەی بەڵگەت لا نەبێ چی.

ابو علي خەریکی کتێبی هەندێ لە ئەهلی کەلام بوو، من رێگریم لێ دەکرد وازی لێ نەدەهێنا، شەوێکیان هات بۆ لام وتی من تەوبەم کردووە، وتم شێک ڕوی داوە؟

وتی بەڵێ، خەوم بینی ئەمشەو لە خەومدا وەک ئەوە بو بێمە ژورەوە بۆ ئەم ماڵەی کە خۆمانی تێداین، بۆنی میسک دەهات بەسەرمدا، دەستم کرد بە گەڕان و شوێن ئەو بۆنە کەوتم هەتا بینیم لەو میحبەرەی حدیثی لەسەر دەنوسرێ ئەو بۆنە بڵاو دەبێتەوە، منیش پێم وت: بەڕاستی خەیر هەر لە حدیثدایە.

[الجامع للخطيب]

قال إبراهيم الحربي رحمه الله: خرج أبو يوسف القاضي يوما، وأصحاب الحديث على الباب فقال: ما على الأرض خير منكم، قد جئتم أو بكرتم تسمعون حديث رسول الله ﷺ.

[سير أعلام النبلاء]

ابراهيمي الحربي دەڵێت: ابو يوسف القاضي ڕۆژێک هاتە دەرەوە، بینی هاوەڵانی حدیث لە بەر دەرگان، فەرمووی هیچ کەسێک نییە لە ئێوە باشتر بێ لەسەر زەویدا بەم بەیانیە زووە هاتوون بۆ ئەوەی گوێتان لە حدیثی رسول الله ﷺ بێت.

قال الإمام الشافعي رحمه اللّه: إذا رأيتُ رجلاً من أصحاب الحديث، فكأني رأيت رجلاً من أصحاب النبي ﷺ، جزاهم اللّه خيراً، هم حفظوا لنا الأصل، فلهم علينا الفضلُ.

[سير أعلام النبلاء]

امامی شافعي دەيفەرموو: هەر کاتێک کەسێک دەبينم لە هاوەڵانی حديث وەک ئەوەيە، يەکێک لە هاوەڵانی رسول اللّه ﷺ ببينم، اللّه جەزای خێريان بداتەوە، هەر ئەوان بوون ئەصڵی ئيسلامەتيان بۆ پاراستين، بەڕاستی فەزڵ و چاکەيان هەيە لەسەرمان.

## من أين يؤخذ العقيدة؟

قال أبو المظفر السمعاني: أبى اللّه أن يكون الحقُّ والعقيدة الصحيحة إلّا مع أهل الحديث لأنّهم أخذوا دينهم وعقائدهم خلفا عن سلف وقرنا عن قرن بإسناد متّصل إلى أن انتهوا إلى التابعين وأخذ التابعون من أصحاب النبيّ ﷺ ولا طريق إلى معرفة ما دعا إليه رسول اللّه ﷺ الناس من الدّين المستقيم والصراط القويم إلّا هذا الطريق الذي سلكه أصحاب الحديث.

[الانتصار لأهل الحديث]

أبو مظفر السمعاني دەڵێت: اللّه تعالى عقیدەی ڕاست و دروستی نەگێڕاوە ئیللا لەگەڵ ئەهلی حدیثدا نەبێ، لەبەر ئەوەی ئەوان بیر و باوەڕ و دینەکەیان وەر گرتووە جیل لە دوای جیل بە ئیسنادی متصل هەتا گەیشتوون بە تابعین، وە تابعین ـیش دینیان وەر گرتووە لە هاوەڵەکانی رسول اللّه ﷺ، هیچ ڕێگەیەک نییە بۆ ئاشنا بوون بەو دەعوە و بانگەوازەی رسول اللّه ﷺ دعوەی خەڵکی پێ دەکرد لە دینی ڕاست و دروست و ڕێگەی ڕاست ئیللا ئەو ڕێگەیە نەبێ ئەهلی حدیث گرتویانەتە بەر.

## عقوبة الاستهزاء بحديث رسول الله ﷺ

هەمو ئەم فەزڵ دەست کەوتانە بۆ ئەو کەسانەیە کە لەسەر ڕێگای سونەت و آثار طلبي عیلم دەکەن بۆ ئەهلی بیدەع نیە.

قال الحافظ الطبراني: سمعت أبا يحيى زكريا بن يحيى الساجي قال: كنا نمشي في أزقة البصرة إلى باب بعض المحدثين فأسرعنا المشي، وكان معنا رجل ماجن متهم في دينه،
فقال: ارفعوا أرجلكم عن أجنحة الملائكة لا تكسروها ! كالمستهزيء
قال: فما زال من موضعه حتى جفت رجلاه وسقط
[من كتاب الرحلة في طلب الحديث للخطيب البغدادي]

طبراني دەڵێت گوێم لە الساجي بوو دەیوت: دەڕۆشتین لە کۆڵانەکانی بصرەدا بۆ لای ماڵی هەندێک لە محدثین، بە سورعەت دەڕۆشتین، پیاوێکمان لەگەڵدا بوو، کەسێکی گاڵتە چی بو متهم بوو بە دینداریێکەی، وتی: قاچەکانتان بەرز بکەنەوە لەسەر باڵی ملائکەتەکان مەیانشکێنن، وەک گاڵتە پێکردنێک،
ساجي دەڵێت: تێنەپەڕی لەو جێگایە هەتا قاچەکانی وشک بوون و دای بە زەویدا.

وەک گاڵتەپێکردنێک بە حدیثي (إِنَّ الْمَلائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا لِطَالِبِ الْعِلْمِ) ئەمەش سزای اللّه بۆ ئەو کەسانەی کە ڕێگای سەلەف یان ون کردووە لە ئیمان بوون بەو دەقە نبوویانەی لە هەر بابێ لە بابەکانی شەرع.

حدثنا زكريا بن عبد الرحمان قال سمعت أحمد بن شعيب يقول: كنا عند بعض المحدثين بالبصرة فحدثنا بحديث (إن الملائكة لتضع أجنحتها لطالب العلم) وفي المجلس معنا رجل من المعتزلة، فجعل يستهزأبالحديث، فقال: واللّه لأطرقن غدا نعلي بمسامير، فأطأ بها أجنحة الملائكة، ففعل، و مشى في النعلين، فجفت رجلاه جميعا، ووقعت في رجليه الأكلة

أحمدي کوڕی شعيب دەڵێت: ئێمە لە لای هەندێک لە ئەهلی حدیث بوین لە بصرە ئەو حدیثەی رسول اللّه ﷺ ي بۆ باس کردین (إن الملائكة لتضع أجنحتها لطالب العلم) لە مەجلیسەکەدا کەسێکمان لەگەڵ بو معتزلة بوو، ئەو کەسە دەستی کرد بە گاڵتە کردن بە حدیث ـەکە و وتی: والله هی سبەینێ نەعلەکانم ڕێک دەکەم و لە پێی دەکەم، دەبێت بە نەعلەکانم قاچ بنێم بە باڵی ملائکەکاندا، أحمدی کوڕی شعيب دەڵێت: بۆ بەیانێکەی ئەو ئەو کارەی کرد و بە نەعلەکانیوە دەڕۆشت و وەک قاچ نان بە باڵی ملائکەکان، دواتر ئەم کەسە قاچەکانی وشک بوون و نەخۆشی الأكلة تێیدا و هەڵوەرین.

لەم دەقانەدا پێگەو مەکانەتی ئەهلی بیدەع مان بۆ دەر دەکەوێت کە ئەوان دینداریان چۆنە لە بەرامبەر فەرمودەکانی رسول اللّه ﷺ، وە جیاوازیان لەگەڵ ئەهلی سوننەدا لە بابی تەسلیم بوندا چۆنە.

## إذا ضيعت الأثر ضيعت العلم فانتبه

عن صالح بن كيسان، قال: اجتمعت أنا والزهري ونحن نطلب العلم، فقلنا: نكتب السنن، فكتبنا ما جاء عن النبي ﷺ ثم قال الزهري: نكتب ما جاء عن أصحابه ; فإنه سنة، قال: قلت أنا: ليس بسنة، فلا نكتبه. قال: فكتب ولم أكتب، فأنجح وضيعت.

[التمهيد لابن عبد البر]

صالحي كوڕی كيسان دەڵێت: لەگەڵ زوهری بە یەكەوە كۆبوینەوە بۆ ئەوەی بچین طلبی عیلم بكەین، وتمان سەرەتا سوننەتەكانی رسول اللّه ﷺ دەنوسینەوە، ئەوەی لە رسول اللّه ﷺ پێمان گەیشت نوسیمان، پاشان زوهری وتی: با ئێستا دەست بكەین بە نوسینەوەی ئەوەی هاتووە لە هاوەڵانەوە، لەبەر ئەوەی قەولی هاوەڵانیش بۆ ئێمە سوننەیە، دەڵێ منیش وتم: نەخێر قەولی ئەوەی لەوانەوە هاتووە سوننەت نییە، و پێویست بە نوسین ناكات، دەڵێ: زوهری نوسیەوە بەڵام من نەم نوسی، زوهری سەر كەوت و ئێمەش لە دەستمان دا.

قال أفلح بن محمد: قلت لابن المبارك: إني أكره الصفة عني صفة الرب تبارك وتعالى، فقال: وأنا أشد الناس كراهة لذلك، ولكن إذا نطق الكتاب بشيء قلنا به، وإذا جاءت الآثار بشيء جسرنا عليه.

[العلو للعلي الغفار]

أفلحي كوڕی محمد دەڵێت: وتم بە ابن مبارك من حەزم بە قسە کردن نییە لە صیفەتدا یعنی صفة اللّه جل جلاله، ابن مبارک فەرمووی: من ئەمەم زۆر لە لا ناخۆشتر و قورسترە، بەڵام هەر شتێک لە قورئان هاتبوو وترابوو ئێمەش دەیڵێین وە ئەگەر آثار وارد بو هاتبوو دەربارەی ئەوا ئتر ترسمان لێی نامێنێت.

قالَ يونسُ بن سليمان، و كانَ عندَ عمر بن هارون؛ نظرتُ في العلم فإذَا القرآنُ و الأثرُ، ثمّ نظرتُ في الأثرِ فإذا.
عظمةُ الرّبِّ، و صفةُ الجنّة و النَّار، و الحلالُ و الحرام، و الأمرُ و النَّهي، و صلةُ الرّحمِ، في أنواعِ الخير.
ثمَّ نظرتُ في الرّأي فإذَا هو:
الخديعةُ، و المكرُ، و الخيانةُ، و الحيلُ، و قسوةُ القلبِ
وأشياءُ كثيرةٌ من الشَّرِّ.. فأخذتُ الأثرَ، و تركتُ الرّأيَ.
[ذمُّ الكلام]

عمري کوڕی هارون دەڵێت: سەیری عیلم و زانستم کرد پێکهاتبوو لە قورئان و آثار، پاشان سەیری آثارم کرد بریتی بوو لە گەورەی پەروەردگار و باسکردنی بەهەشت و جهەنەم و حەڵاڵ و حەرام و ئەمر بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە و گەیاندنی سیلەی ڕەحم و ئەنواعی خەیر لە آثاردا هەبوو،

دواتر سەیری ڕأی و هەواو ئارەزوم کرد بریتی بو لە: فێڵکردن و هەڵخەڵەتاندن و خیانەت کردن و دڵ ڕەقی و زۆڕێک لە کاری خراپەی دیکە،

دواتر دەفەرمووێت دەستم گرت بە آثارەوە و وازم هێنا لە ڕأي.

## يا طالب العلم كلما زاد علمك زاد أعدائك

قال أحمد بن خالد بن الحروري: دخل أبو زرعة بغداد متوجهاً إلى الحج فاجتمع إليه الحفاظ يذاكرونه وهو يجيب ويغلبهم في المذاكرة حتى عجزوا عن مذاكرته فقام واحد منهم فقال في أذنه: "يا داماما" وشتمه بأقبح شتيمة فتبسم أبو زرعة وقال له: يا هذا اشتغل بالعلم فإن هذا بعيد مما نحن فيه.

[تاريخ دمشق لابن عساكر في ترجمته، وتهذيب الكمال]

أحمد بن خالد دەڵێت: أبو زرعە هاتە بغداد بەرەو حج دەچوو، حافظەکان لێی کۆبوونەوە لە بغداد مذاکرەی علم و حدیثیان لەگەڵ دەکرد ئەویش جوابي دەدانەوە،

مغالبەی کردن ابو زرعە و بەزاندنی هەتا وای لێهات نەیان توانی بەردەوام بن لە مذاکرە کردن لەگەڵیدا، کەسێک لە مجلیسەکەدا هەڵساو چپاندی بە گوێی ابو زرعەدا وتی، یا داماما، شتمی ابو زرعەی کرد و قسەی پێوت بە شێوەیەکی زۆر ناشرین،

ابو زرعە زەردەخەنەیەکی کرد و پێی وت: یا هذا مشغوڵ ببە بە علم و زانستەوە، ئەمەی تۆ دەیڵێی لە قسە پێوتن، دوورە لەوەی ئێمە تێیداین.

---

١ - پێی ناخۆش بوە ئەو هەمۆ حافظەی بەزاندوە لە بغداد مەعلومە =

قتادة دەڵێت: بەسەر هیچ کەسانێک و قەومانێکەوە نیعمەت اللّە زیاد ناکات زۆر نابێ،. ئیللا لەگەڵ زیادەی نیعمەتدا دوژمنیان بۆ زیاد و زۆر دەبێ.

[العلل]

---

= ابو زورعە چۆن بوە لە حیفظدا، بۆیە طالبي علم دەبێت بزانێت هەر کات علم و زانستت زیاتر زیاد بکات زیاتر دژایەتی دەکرێیت لە چواردەورتەوە.

## رسالة أحمد بن عاصم

عن إِسْحَاقُ بْنُ عَبْدِ الْمُؤْمِنِ الدِّمَشْقِيُّ، قَالَ: كَتَبَ إِلَيَّ أَحْمَدُ بْنُ عَاصِمٍ الْأَنْطَاكِيُّ، فَكَانَ فِي كِتَابِهِ: إِنَّا أَصْبَحْنَا فِي دَهْرِ حَيْرَةٍ، تَضْطَرِبُ عَلَيْنَا أَمْوَاجُهُ بِغَلَبَةِ الْهَوَى، الْعَالِمِ مِنَّا وَالْجَاهِلِ، فَالْعَالِمُ مِنَّا مَفْتُونٌ بِالدُّنْيَا مَعَ مَا يَدَّعِيهِ مِنَ الْعِلْمِ، وَالْجَاهِلُ مِنَّا عَاشِقٌ لَهَا، مُسْتَمْلأٌ مِنْ فِتْنَةِ عَالِمِهِ، فَالْمُقِلُّ لَا يَقْنَعُ، وَالْمُكْثِرُ لَا يَشْبَعُ، فَكُلٌّ قَدْ شَغَلَ الشَّيْطَانُ قَلْبَهُ بِخَوْفِ الْفَقْرِ، فَأَعَاذَنَا اللَّهُ وَإِيَّاكَ مِنْ قَبُولِنَا عِدَةَ إِبْلِيسَ وَتَرْكِنَا عِدَةَ رَبِّ الْعَالَمِينَ. يَا أَخِي لَا تَصْحَبْ إِلَّا مُؤْمِنًا يَعِظُكَ بِفِعْلِهِ وَمَصَادِيقِ قَوْلِهِ، أَوْ مُؤْمِنًا تَقِيًّا، فَمَتَى صَحِبْتَ غَيْرَ هَؤُلَاءِ وَرَّثُوكَ النَّقْصَ فِي دِينِكَ، وَقُبْحَ السِّيرَةِ فِي أُمُورِكَ، وَإِيَّاكَ وَالْحِرْصَ وَالرَّغْبَةَ، فَإِنَّهُمَا يَسْلُبَانِكَ الْقَنَاعَةَ وَالرِّضَا. وَإِيَّاكَ وَالْمَيْلَ إِلَى هَوَاكَ، فَإِنَّهُ يَصُدُّكَ عَنِ الْحَقِّ، وَإِيَّاكَ أَنْ تُظْهِرَ أَنَّكَ تَخْشَى اللَّهَ، وَقَلْبَكَ فَاجِرٌ، وَإِيَّاكَ أَنْ تُضْمِرَ مَا إِنْ أَظْهَرْتَهُ أَخْزَاكَ، وَإِنْ أَضْمَرْتَهُ أَرْدَاكَ، وَالسَّلَامُ.

[ذم الدنيا لابن أبي الدنيا]

إسحاقي كوڕی عبد المؤمن الدمشقي دەڵێت: احمدي كوڕی عاصم الأنطاكي بۆی نوسيبووم له نامەيەكدا: ئێمه له سەردەمێكدا دەژين خەڵكی توشی سەر لێشێواوی و حيره بوونه، لەسەردەمێ كدا دەژين شەپۆلی سەر لێشێواوی بە ناوماندا دێت و دەچێت بە زاڵ بونی هەوا، عالم و زانا و جاهيل و نەزان وەک يەكن و سەريان لێ تێك

چووە، ئەوانەی کە زانان لە ئێمە هەڵ خەڵەتاوە بە دونیاو تووشی
فیتنە بووە لەگەڵ ئەو عیلم و زانستەی لایەتی و بانگەشەی بۆ
دەکات، وە جاهیل و نەزانەکان ـیش عیشق خۆشەویستی دونیا
چوەتە دڵیانەوە، دڵیان پڕ بووە لە فیتنەی زانا و عالم ـەکان کە
دەستیان گرتووە بە دونیاوە، ئەو کەسەی بەشی کەمە لە دونیا
قەناعەتی نییە، وە ئەوەشی کە بەشی زۆری هەیە لە ماڵ و سامان
لە دونیادا تێر نابێت، هەمووومان شیطان دڵەکانمانی مەژغوڵ
کردووە بە ترسان لە فەقیری، پەنای خۆم و تۆ دەگرم بە اللّه لەوەی
کە دڵمان وەعدی ابلیسي قبوڵ بێت کە ترسانە بە فەقیری و هەژاری،
وە واز بهێنێت لە وەعدی رب العالمین کە دابینکردنی رزقی هەموو
مرۆڤەکانە، دەی براکەم: هاوەڵێتی و هاوڕێیەتی هیچ کەسێک مەکە
ئیللا ئیماندارێکی بە تەقواو خۆپارێز نەبێ، بە کار و کردەوەکانی
ئامۆژگاریت بکات وە بە ڕاستگۆی قسەکانی ئامۆژگاریت بکات،
ئەگەر هاتوو هاوڕێیەتی کەسانی ئیماندار نەکەیت هاوڕێیەتی
غەیری ئەوان بکەیت ئەوا لە دینداریتدا دایم بەرەو سارد بونەوە و
کەمبونەوە دەچیت، خورەوشتت ناشرین دەکەن و کارەکانت تێک
دەدەن، ئامان ئاگاداربە سور نەبی لە بەدەستهێنانی دونیا و
ڕەغبەتت بۆی نەبێ، لەبەر ئەوەی پێداگریت لەسەر دونیا و
ڕەغبەتت بۆی، قەناعەت و ڕازی بونت بە بەشی اللّه لێوەردەگیرێتەوە
و نای هێڵێت، ئامان مەیلت نەبێ بۆ هەواو ئارەزووەکانت، لەبەر



ئەوەی لات دەدەن لە حەق و ڕاستی، ئامان ئاگاداربە کە لای خەڵکی وا پیشان بدەیت کە تۆ کەسێکی لە اللّٰه دەترسی بەڵام ناخ و دڵت کەسێکی فاجر و خراپەکار بیت، ئامان ئاگاداربە شتانێک لە ناخت و دڵت نەشاریتەوە کە ئەگەر ئاشکرای بکەی لە لای خەڵکی ئەوا فضحت بکات و سوکت بکات، وە ئەگەر ئەو شتانەت تێدا بوو وە شاردتەوە ئەوا لە کۆتای تیات دەبات و بە هەلاکت دەبات، والسلام





## واعلم بأن العلم بالتعلم

ابن عبد البر دەڵێت: باشترین و جوانترین شتێک لە ئادابی طلبی عیلم و فیقهدا بینیبێتم ئەو قصیدە و نظمەیە کە نیسبەت دراوەتە لای اللؤلؤي لە الرَجَز، هەندێک یش نیسبەتیان داوەتە لای مأمون: کە هاتووە تێیدا:

وَاعْـــلَـمْ بِأَنَّ الْعِـلْـمَ بِالتّـعَـلُّمِ ... وَالْحِــفْــظِ وَالْإِتْـقَانِ وَالتَّـفَهُّمِ
وَالْعِـلْـمُ قَــدْ يُرْزَقُهُ الصَّــــغِيرُ ... فِي سِــنِّـهِ وَيُــحْـرَمُ الْكَـبِيـرُ
وَإِنَّـمَـــا الْمَـــــرْءُ بِأَصْـغَرَيْـهِ ... لَيْسَ بِــرِجْلَـيْـهِ وَلَا يَـدَيْـهِ
لِسَـــانُـهُ وَقَــلْـبُـهُ الْمُــرَكَّـبُ ... فِي صَـــدْرِهِ وَذَاكَ خُلْقٌ عَـجَـبُ
وَالْـعِـلْـمُ بِـالْفَـهْمِ وَبِالْـمُـذَاكَـرَةِ ... وَالدَّرْسِ وَالْفِكْـرَةِ وَالْمُـنَاظَـرَةِ
فَــرُبَّ إِنْســـــَانٍ يَنَالُ الْحِـفْـظَـا ... وَيُورِدُ الـنَّـصَّ وَيَحْـكِـي اللَّفْظَا
وَمَـــــــا لَهُ فِي غَيْرِهِ نَـصِــيـبٌ ... مِـمَّـا حَـوَاهُ الْـعَـالِـمُ الْأَدِيبُ
وَرُبَّ ذِي حِـرْصٍ شَـدِيـدِ الْحُـبِّ ... لِلْعِلْمِ وَالــذِّكْـرِ بَـلِيـدُ الْقَـلْـبِ
مُـعْـجِـزٌ فِي الْـحِـفْظِ وَالـرِّوَايَـةِ ... لَيْسَــتْ لَهُ عَـمَّـنْ رَوَى حِـكَايَةٌ
وَآخَــرُ يُـعْــطِـي بِلَا اجْـتِـهَـادِ ... حِفْظًا لِمَا قَـدْ جَـاءَ فِي الْإِسْنَادِ
يَــهْــدِهِ بِـالْـقَـلْـبِ لَا بِـنَـاظِــرِهِ ... لَيْسَ بِمُـضْـطَـرٍّ إِلَى قَـمَاطِـرِهِ
فَالْتَمِسِ الْعِلْمَ وَأَجْمِلْ فِي الطَّلَبِ ... وَالْـعِلْـمُ لَا يَـحْسُــنُ إِلَّا بِالْأَدَبِ
وَالْأَدَبُ النّـَافِـعُ حُسْــنُ السَّـــمْتِ ... وَفِــي كَثِيرِ الْقَوْلِ بَعْضُ الْمَقْتِ

فَكُنْ لِحُسْنِ السَّمْتِ مَا حَيِيتَا ... مُقَارِفًا تُـحْـمَـدُ مَـــــا بَقِيتَا
وَإِنْ بَدَتْ بَيْنَ النَّاسِ مَسْأَلَةٌ ... مَـعْـرُوفَةٌ فِـي الْعِلْمِ أَوْ مُفْتَعَلَةٌ
فَـلَا تَكُنْ إِلَى الْجَوَابِ سَابِقًا ... حَتَّى تَـرَى غَيْرَكَ فِـيـهَا نَاطِقَا
فَكَمْ رَأَيْتُ مِنَ عَجُولٍ سَـابِقٍ ... مِـــنْ غَيْرِ فَـهْمٍ بِالْخَطَأِ نَاطِقِ
أَزْرَى بِـهِ ذَلِكَ فِي الْمَـجَالِسِ ... عِـــنْـدَ ذَوِي الْأَلْبَابِ وَالتَّنَافُـسِ
وَقُـــلْ إِذَا أَعْـيَاكَ ذَاكَ الْأَمْرُ ... مَالِي بِـمَـــا تَسْــأَلُ عَنْهُ خَبَرُ
فَذَاكَ شَطْرُ الْعِلْمِ عِنْدَ الْعُلَمَا ... كَـذَاكَ مَا زَالَتْ تَـقُـولُ الْحُكَمَا
وَالصَّمْتُ فَاعْلَمْ بِكَ حَقًّا أَزْيَنُ ... إِنْ لَمْ يَـكُـنْ عِنْدَكَ عِـلْـمٌ مُتْقَنُ
إِيَّاكَ وَالْعُجْبَ بِفَضْــــلِ رَأْيِكَا ... وَاحْذَرْ جَوَابَ الْقَوْلِ مِنْ خَطَائِكَا
كَـمْ مِنْ جَوَابٍ أَعْقَبَ النَّدَامَةَ ... فَاغْتَنِمِ الصَّــمْتَ مَعَ السّـَلَامَةِ
الْـعِـلْـمُ بَـحْــرٌ مُنْتَهَاهُ يَبْعُدُ ... لَيْسَ لَهُ حَــــدٌّ إِلَيْهِ يُقْـصَــــدُ
وَلَيْسَ كُـــلُّ الْعِلْمِ قَدْ حَوَيْتَهُ ... أَجَــلْ وَلَا الْعُشْـرَ وَلَوْ أَحْصَيْتَهُ
وَمَـــا بَقِيَ عَلَيْكَ مِـنْـهُ أَكْثَرُ ... مِـمَّـــا عَلِمْتَ وَالْجَــــوَادُ يَعْثُرُ
فَكُنْ لِمَا سَـــمِعْتَهُ مُسْتَفْهِمَا ... إِنْ أَنْتَ لَا تَـفْـهَـمُ مِنْهُ الْكَلِمَا
الْقَـــوْلُ قَـوْلَانِ فَقَوْلٌ تَعْقِلُهُ ... وَآخَـرُ تَسْــمَـعُـهُ فَـتَـجْهَلُهُ
وَكُـــلُّ قَـــوْلٍ فَلَهُ جَـــوَابٌ ... يَجْـمَـعُـهُ الْبَاطِلُ وَالصَّــــوَابُ
وَلِلْــكَـــلَامِ أَوَّلٌ وَآخِـــــرُ ... فَافْهَمْهُمَا وَالذِّهْنُ مِنْكَ حَاضِرُ
لَا تَـــدْفَعِ الْقَـــوْلَ وَلَا تَـرُدَّهُ ... حَتَّى يُؤَدِّيَكَ إِلَى مَـــا بَـــعْـدَهُ
فَـرُبَّمَا أَعْيَى ذَوِي الْفَضَـــائِلِ ... جَوَابُ مَا يَلْقَى مِـنَ الْمَسَـائِلِ
فَيُمْسِكُوا بِالصَّمْتِ عَنْ جَوَابِهِ ... عِنْدَ اعْتِرَاضِ الشَّكِّ فِي صَوَابِهِ

وَلَوْ يَكــُونُ الْقَــــوْلُ فِـي الْقِيَاسِ ... مِـنْ فِضَّـــةٍ بَيْضَاءَ عِنْدَ النَّاسِ
إِذًا لَكَانَ الصَّمْتُ عَيْنٌ مِنَ الذَّهَبِ ... فَافْهَمْ هَدَاكَ اللّهٌ آدَابَ الطَّلَبِ

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على المرسلين والحمد لله رب العالمين